# چیرۆکە کاریگەرەکان

# بۆ کچانی لاو

## کۆمەڵە چیرۆکێکی واقعی و پەروەردەیی

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com



نووسینی
ئەحمەد سالم بادویلان

وەرگێڕانی
حوسێن مەحمود هەڵەبجەیی

سێیەم چاپ
٢٠١٣

# چیرۆکە کاریگەرەکان

## بـــۆ کچانی

# ٩٠






ناسنامەی

ناو: چیرۆکە کاریگەرەکان بۆ کچانی لاو

بابەت: چیرۆکی ڕاستەقینە

نووسینی: ئەحمەد سالم بادویلان

وەرگێرانی حسین محمود هەڵەبجەیی

چاپخانە: ڕۆژهەڵات

چاپ: سێیەم/ 2013

تیراژ: (1000) دانەر

بەرهەم: (108)






لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٣٦)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.



07504671394

07501181919

07504885903

hawler.chap@gmail.com


کتێبخانەی سارا
کتێب - نامیلکە - بۆنی خۆش
سلێمانی : بازاری راپەڕین

# چیرۆکە کاریگەرەکان بۆ کچانی لاو

ن/ ئەحمەد سالم بادویلان.

و/ حسێن محمود هەڵەبجەیی

سێیەم چاپ
هەولێر ٢٠١٢.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ✍ پێشەکی

سوپاس بۆ خوای جیهانیان ، دروود و سلاوات بۆ سەر پێغەمبەری ئازیزمان محمدﷺ و بۆ سەر یار و یاوەرانی و ئەوانەی بە چاکی شوێنکەوتەی ئەوانن هەتا رۆژی دوایی.

پاشان: خوای گەورە دەفەرمویێت (لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُوْلِي الألْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى ... ) واته ( بە راستی لە چیرۆك و بەسەرهاتەکانیاندا پەند و ئامۆژگاری تێدایە بۆ هۆشمەندان، ئەمانە قسە وباس نین هەڵبەسترابن).

زۆر جار دەبیستین یان دەخوێنینەوە کە فلان ئەدیب نوسەرێکی واقیعیە... مەبەستیش لەم نازناوە شاخدارە تەنها ئەوەیە کە نووسەرەکە وێنەی شاز و نموونەی دەرەوەی نەریت و واقیعی هێناوە و لە ئەندێشەی خۆیدا واقیعێکی بۆ دەسازێنێ کە پێچەوانەی راستیەکانە، ئەو نووسەرە واقیع دادەرێژێ لە روانگەی دیدی خۆیەوە، یان خۆی چۆنی دەوێت بە ئارەزوو و حەزی خۆی دایدەرێژێت.

ئێمە برا و خوشکی خوێنەر، تەنها نین لـەم جیهانـەدا، لە سـەرووی ئێمـەوە توانایـەك کـە لـە سـەرووی توانـای ئێمەوەیە و ناوی قەدەرە و دەسەڵاتێك حـوکم دەکـات نـاوی دادگایە و ئەم دوو کـارە بەدەسـت خـوای گەورەوەیـە، کـە نوسـەری واقیعـی دوور دەکەوێتـەوە لـە باسـکردنی و دووردەکەوێتەوە لە باسـکردنی دەسـەڵات و حوکمیـدا لـە روودانی واقیعێکی روپۆش.

نموونەی ئەو جۆرە نوسەرانە یاری دەکەن بە رووداوەکـان لە گەڵ پاڵەوانی چیرۆکەکاندا و کۆتاییـەکان بـە هـەردوو چـاوی خـۆی دەبینێـت کـە دەرناچـێت لـە سـنووری ئـەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ کە دەفـەرموێت (كَمَا تُدِينُ تُدَانُ) واتـە (چـی بـچێنیت ئـەوە ئەدووریتـەوە) یـان فەرموودەی خوای گەورە کـە دەفـەرموێت (...كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ)(الطـور/٢١) واتـە( هەرکەسـە بارمتـەی کردوەکانی خۆیەتی).

لەم کتێبـەدا پـشتمان بـە هەڵبـژاردن و پوختـەکردن بەسـتووە، کۆمـەڵێ چـیرۆکی واقیعیمـان دەرهێنـاوە بـە

کەسایەتیەکان و رووداوەکان وکۆتاییە خۆش و ناخۆشەکانیانەوە بە بێ یاری پێکردنی ئارەزووی نووسەرەکە و بە بێ سۆزداری بۆی و بە بێ زاڵکردنی خەیاڵ بەسەریدا، فەزڵ تەنها دەگەڕێتەوە بۆ خوا و ئەو بەهرەیەی داویەتی بەو پێنووسەی کە ئەم واقیعەی بە دەست پاکی و ئەمانەتەوە گواستوەتەوە.

ئێمەش ئەم چیرۆکانەمان خستووەتە بەردەستی خوشکانی موسڵمان تا تەماشای ئەو واقیعە بکەن و ئاین و ژیان و ئاسمان و زەوی لە یەکتر جیاناکاتەوە تاوەکو خوشکی موسڵمان ئەو راستیە لارەوە بووە ببینێت و بە هیچ خوشکێکی درۆینە فریو نەدرێت کە سەرەنجامەکەی پەشیمانی و لەزەتێکە کە ئاه و حەسرەت دێت بە دوایدا، با دیمەن و رواڵەتە ناوبۆشەکان و دروشمە وبریق و باقەکان راینەکێشێت و بە بیناییەوە تەماشا بکات نەك بە چاوی، ئەو کاتە راستیەکان ئاشکرا دەبینێ و ئەنجامەکان پەیوەستدار دەکات بە سەرەتاکانیەوە وەك لە یەکێك لە چیرۆکەکاندا هاتووە (بەختیار ئەو کەسەیە کە پەند لە کەسی ترەوە وەربگرێت).

دەخوازم لە خوای گەورە پەند و سوود و ئامۆژگاری لێوەربگرین.

واللە ولی التوفیق

دانەر

## چی بچێنیت ئەوە دەدوریتەوە

چەندە شەوی پەردە خەونی ئافرەتانی هەرزەکار بێت، ئەوەندەش مەبەست و ئامانجی کوڕانە کە هەوڵدەدەن بۆ بەدیهێنانی... بەڵکو هەندێ لە کوڕان و کچان بە هەموو شێوازێك هەوڵی بۆ دەدەن، لەسەر بنەمای مەبەست بەهانەیە بۆ هۆکار(الغَايَة تُبَرِّرُ الوَسِيلَة)، تەنانەت ئەگەر ئەو هۆکارەش پێچەوانەی ئیسلام بێت، یان دەست دەکات بە ئەنجامدانی لەزەتێکی حەرامکراو بە وتووێژی تەلەفۆنی و پەیوەندی سۆزداری یان لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە.

ئەو ئافرەتە داوێنپاکە کە بە درێژایی ژیانی بێجگە لە مەحرەمەکان پیاوانی تری نەبینیوە، باوەڕ بکە ئافرەتێکە کە ناتوانێت لەم سەردەمەدا شوو بکات، هەرچەندە دواکەتنی تەمەنی شوکردن لەوانەیە ڕۆزیەك بێت و خوای گەورە پیاوێکی صاڵحی بکات بە تووشەوە و هەموو ژیانی بەختەوەر بێت.

بەلام پاڵەوانی ئەم چیرۆکە، کچێکی موسڵمانی داوێن پاك و بەرەوشتە و روخساری داپۆشیوە و پابەندە بە ئاینەکەی و بەرزی رەوشتیەوە، خوای گەورەش پیاوێکی موسڵمانی پێ بەخشیوە کە باشە لە گەڵیدا و زۆری لێناکات و رووخساری و دەستەکانی و هەندێ لە لەشی دەرخات کە هەندێ لە کچانی ئەمڕۆ وادەکەن بە ناوی پێشکەوتنەوە و بە دەنگی بەرز قسە دەکەن و لەبەردەم پیاواندا خەندە دەکەن و پێدەکەنن بە بێ شەرمکردن و بەخۆداچوونەوە.

ساتی پەردە هاتە پێشەوە لەسەر شێوازێکی ئیسلامیانەی سادە.. بوك و زاوا چوونەماڵی خۆیانەوە، ژنەکە نانی ئێوارەی پێشکەش بە مێردەکەی کرد و پێکەوە دانیشتن لە سەر سفرە.

لە پڕ هەردووکیان گوێیان لە تەقەی دەرگا بوو، مێردەکەی بە تووڕەیی و بێزاریەوە وتی: ئەوە کێیە لەم ساتەوەختەدا هاتووە؟

ژنەکەش هەستا دەرگاکە بکاتەوە، لە پشت دەرگاکەوە وەستا و پرسی کێیە؟ دەنگێکیش لەودیو دەرگاکەوە وەڵامی دایەوە: هەژار و داماوم هەندێ خواردنم دەوێت.

ژنەکەش گەڕایەوە بۆ لای مێردەکەی و... ئەویش لێ پرسی: کێ بوو دای لە دەرگا؟

ژنەکەش وتی: هەژارێك بوو داوای خواردنی دەکرد.

مێردەکەشی تووڕە بوو، وتی: ئایا ئەو هەژارە دەیەوێت ئەم خۆشیەمان لێ تێکبدات، لە کاتێکدا ئێمە لە یەکەم شەوی هاوسەرگیریداین؟ پیاوەکە رۆشت بۆ هەژارەکە و تێروپڕی لێدا و پاشان زۆر بە خراپی دەری کرد، پیاوە هەژارەکەش رۆشت و دوورکەوتەوە کە هێشتا برسیەتی و برینداری زاڵ بوو بوو بەسەر رۆحی و جەستەی بەڕێزیدا.

پاشان مێردەکە گەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی و زۆر بێتاقەت بوو بە هۆی ئەو پیاوەوە کە خۆشی دانیشتنەکەیانی لەگەڵ ژنەکەی لێ تێکدان.

لە پڕ پیاوەکە تووشی حاڵەتێکی نائاسایی بوو، هەموو دنیا لەبەر چاویدا تەسك بوویەوە و بە قیڕە و هاوار لە ماڵ

دەرچوو، ژنەکەی بەجێهێشت کە لە دیمەنی مێردەکەی تۆقیبوو، کە لە شەوی یەکەمی هاوسەرگیردا بەجێیهێشت... بەڵام دیارە ئەمە بە ویستی خوای گەورەیە.

ژنەکە ئارامی گرت و بە تەمای پاداشتی پەروەردگار بوو، بەو شێوەیە مایەوە تا بۆ ماوەی پانزە ساڵ.. دوای ئەو ماوەیە کە تێپەڕی بەسەر ئەو رووداوەدا، پیاوێکی موسڵمان هاتە داوای ئافرەتەکە و ئەمیش رازی بوو پێی، بوونە هاوسەری یەکتر، لە شەوی یەکەمی هاوسەرگیریاندا، ژن و مێردەکە لەسەر خوانی ئێوارە کۆبوونەوە، لە پڕ هەردووکیان گوێیان لە تەقەی دەرگاوە بوو.

مێردەکەی بە ژنەکەی ووت: بڕۆ بزانە کێیە لە دەرگا دەدات؟

ژنەکە هەستایەوە لەم دیوی دەرگاکەوە وەستا و پرسی کێیە لە دەرگا دەدات؟

دەنگێکیش لە پشت دەرکاگەوە وتی: هەژارم و کەمێك خواردنم دەوێت.

ژنەکەش گەڕایەوە بۆ لای مێردەکەی و ئەویش لێ پرسی: کێیە لە دەرگا دەدات؟

ژنەکەش وتی: هەژارێکە و داوای هەندێك خواردن دەکات...

مێردەکەشی سینیەکەی بەردەمی بەرزکردەوە و وتی بە ژنەکەی هەموو خواردنەکەی بۆ ببە و وازی لێبێنە تا تێر دەخوات و پاشان چەندی لێ مایەوە ئێمەش دەیخۆین.

ئینجا ژنەکە رۆشت و خواردنەکەی خستە بەردەم پیاوەکە و بە گریانەوە گەرایەوە و مێردەکەشی لێپرسی: ئەوە چیتە؟ چی روویداوە ئایا قسەی پێ وتیت؟

ژنەکەش بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە وتی: نەخێر

- ئەی لۆمەی کردیت؟

+ نەخێر

- ئەی ئازاری دایت؟

+ نەخێر

- ئەی بۆچی دەگریت؟

+ ئەو پیـاوەی لـە بەردەرگاکـەی تـۆدا دانیـشتووە و لـە خواردنی تۆ دەخوات، پێش پانزە ساڵ لەمەو پێش مێـردی من بوو، لە شەوی یەکـەمی هاوسـەرگیردا هـەژارێك لـە دەرگاکەمانی دا و مێردەکەم رۆشـت بـۆی و زۆری لێـدا و پاشان دەریکرد، پاشان زۆر بە تووڕەیەوە گەڕایـەوە بـۆ لای مـن، دوایـی وام هەسـت دەکـرد کـە جنۆکـە چـووبێتە لەشـیەوە، بـە هـات و هـاوار رایکـردە دەرەوە و خۆشـی نەیدەزانی بۆ کوێ دەروات، دوای ئـەوە ئـیتر نەمبینیـەوە، ئێستا ئەو خەریکی سواڵ و دەرۆزەکردنە.

مێردەکەشی دەستی کرد بە گریان..

ژنەکەش وتی: ئەی تۆ بۆچی دەگریت؟

- ئایا ئەزانی ئەو پیاوەی مێردەکەت لێیدا کێ بووە؟

+ کێ بوو؟

- ئەوە من بووم!!

پاکو بێگەردی بۆ خـوای بـاڵا دەسـتی تۆڵەسـێن، کـە تۆڵەی بەندە هەژارەکەی کردەوە کە بەسـەری نەویـەوە لـە خەڵکی دەپاڕایەوە و بە هۆی برسیەتیەوە ئازاری دەچەشت،

مێردی ئەو ژنەش ئەوەندەی تر ئازارەکەی بۆ زیاد کرد و وای لێکرد بڕوات و دڵیشی لە خەفەت و داخ و حەسەرت خەریك بوو شەقی دەبرد.

بەڵام خوای گەورە رازی نابێت بە زوڵمکردن، بۆیە سزای خۆی دابەزاند بۆ سەر ئەو کەسەی سوکایەتی بە مرۆڤێك دەکات و زوڵمی لێ دەکات و دەرووی کردەوە لە بەندەیەکی ئارامگر... بۆیە دنیای بۆگۆڕین و رۆزی بەخشی بە پیاوە هەژارەکە و دەوڵەمەندی کرد و بەڵایشی نارد بۆ پیاوە زاڵمەکە و و عەقڵ و ماڵی خۆی لە دەستدا و پاشان کردی بە سواڵکەر.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە رۆزیی بەخشی بە ئافرەتێکی ئیماندار کە ئارامیگرت لە سەر تاقیکردنەوەیەك بۆ ماوەی پانزە ساڵ ، خوای گەورەش بە مێردێك قەرەبووی بۆ کردەوە کە لە مێردەکەی پێشووی باشتربوو موسڵمان بوونی کچێکی مەسیحی کاتێ ئاکاری جوانی خوشکانی موسڵمان دەبینێت وەك هەر ئافرەتێکی تری مەسیحی میسری گەورە بووم لە سەر دەمارگیری بۆ

ئاینی مەسیحی، دایك و باوكم سووربوون لەسەر ئەوەی هەموو بەیانیەكی رۆژانی یەك شەممە لە گەڵ خۆیاندا بمبەن بۆ كەنیسە تا دەستی قەشە ماچ بكەم، لە دوایەوە وتارەكانی كەنیسە بڵێمەوە و گوێی لێبگرم، كە قسەی بۆ خەڵكان دەكرد و باسی عەقیدە و كردن بە سیان (تثلیث)ی بۆ دەكردن و جەختی دەكردەوە بۆیان بە لاوازترین ئیمان، ئەگەر نا مەسیحیەكان هەرچەندە چاكە ئەنجام بدەن ئەوە هەر نەفرەت لێكراون لە لایەن خواوە چونكە بە پێی ئەو بێباوەڕ و كافرن.

من گوێم لە قسەكانی قەشەكە دەگرت بە بێ ئەوەی وەریان بگرم، منیش وەكو منداڵانی تر، كاتێكیش لە كەنیسەوە دەچوومە دەرەوە رامدەكرد بۆ لای هاوڕێ موسڵمانەكەم تا یاری لە گەڵدا بكەم، چونكە لە قۆناغی منداڵیدا مرۆڤ ئاگای لە رق و كینە نیە، كە قەشەكە دەیچاند لە دڵی خەڵكیدا...

كەمێك گەورە بووم، چوومە قوتابخانەوە، دەستمكرد بە دروستكردنی هاوڕێیەتی لەگەڵ هاوڕێكانی قوتابخانەكەدا

کە لە پارێزگای (سویس) بــوو.. لــە قوتابخانــە  وردە وردە چاوم خەریك بوو دەکرایەوە بەسەر ئاکارە جوانەکانــدا کــە رەنگی دەدایەوە لــە هەڵــسوکەوتی کــچە موســڵمانەکانی هاورێمدا، ئەوان وەکو خوشك هەڵسوکەوتیان لەگەڵ منـدا دەکــرد و تەمــاشــای جیــاوازیی ئــایینی مــن و خۆیانیــان نەدەکرد... پاشتر تێگەیشتم کــە قورئــانی پــیرۆز داکــۆکی دەکات کە مامەڵەکردن لە گەڵ بێباوەڕاندا (واتە ئەوانەی کە ناجەنگن) دەبێت مامەڵەیەکی باش بێت، بە ئومێــدی موسڵمانکردنیان و رزگارکردنیان.

خوای گەورە دەفــەرموێت [لاَ يَنْهَـاكُمْ اللهُ عَـنْ الّـذِينَ لَـمْ يُقَـاتِلُوكُمْ فِي الـدِّينِ وَلَـمْ يُخْرِجُـوكُمْ مِـنْ دِيَـارِكُمْ أَنْ تَـبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ] الممتحنة/ ٨)

واتە: (خوا رێتان لێناگرێ لەگەڵ ئەوانــەدا کــە جــەنگیان لەگەڵدا نەکردوون لەسەر ئەم دینە و دەریان نەکردوون لە جێگە و شــوێنەکانتان، کــە چــاکەیان لەگەڵــدا بکــەن و دادیان لە گەڵدا بنوێنن، بە راستی خوای گەورە دادگەرانی خۆش دەوێت).

یەکێك لە هاوڕێ موسڵمانەکان پەیوەندیەکی تونـدتۆڵ دەیبەستینەوە بە یەکەوە، من لێی جیا نەدەبوومەوە تـەنها لە کاتی وانەکانی پەروەردەی ئایینی نەبێت، چـونکە مـن بە پێی سیستەمی خوێندن لەگەڵ خوێنکـارانی قوتابخانـە مەسیحیەکان بنەمای ئایینی مەسیحیم دەخوێند، لەسـەر دەستی مامۆستایەکی ئافرەتی مەسیحی.

دەمەویست لە مامۆستاکەم بپرسم چۆن دەبێت بە پێی بۆچوونی مەسیحیەکان موسڵمانان بێ باوەڕبن، کاتێك کە خـاوەنی ئـەو هـەموو ئاکـار و رەوشـتە بـەرز و رەفتـارە شیرینەن؟ بەڵام نەمدەوێرا پرسیارەکە بکەم، لە ترسی تووڕە بوونی مامۆستاکە، تا رۆژێکیان غیرەت گرتمی و پرسـیارم کرد، پرسیارەکەم شتێکی کتوپڕ بـوو بـۆ مامۆسـتاکە و ویستی تووڕەبوونی خـۆی بـشارێتەوە، خەندەیـەکی زەردی خستە سەر لێوانی و پێی وتم: ( تـۆ هێـشتا منـداڵیت و هێشتا لە دنیا تێنەگەیـشتوویت مەیەڵـە ئـەم رووکـار و رواڵەتـە سـادانە فریـوت بـدات لـە راسـتەقینەیی

موسڵمانەکان، وەك ئەو شـێوەیەی کـە ئێمـەی گـەورەکان دەیانناسین)

منیش بۆ خۆم بێدەنگ بووم، هەرچـەندە متمانـەم بـە وەڵامەکەی نەبوو، کـە نابابـەتی و ناژیرانـە بـوو... مـاڵی ئازیزترین هاوڕێم باریانکرد بۆ قاهیرە، ئـەو ڕۆژە بـە هـۆی دابڕانمانەوە زۆر گریـاین و چـەند دیـاری و یادگاریـەکمان گۆڕیەوە، هاوڕێ موسڵمانەکەشم دیاریەکی شك نەبرد کـە گوزارشت لە قوڵی و هێزی هاوڕێیەتی خـۆی بکـات بـۆم بێجگە لە قورئانێکی پـیرۆز کـە لـە پاکـەتێکی جـوانی بچوکدا بوو، پێشکەشی کردم و وتی" بیرم لە دیاریەکی گرانبـــەها کـــردەوە تـــا پێـــشکەشی تـــۆی بکـــەم، وەك یادگاریەکی هاوڕێیەتی و تەمەنێك کـە پێکـەوە ژیـاوین، هیچم شك نەدەبرد بێجگە لەم قورئانە نەبێت کـە بریتیـە لە وتەی خوای گەورە)

دیاری کچە موسڵمانەکەم وەرگرت، هەر کاتێ بانگبێژ بانگی بدایە و موسڵمانانی بانگ بکردایە بـۆ مزگـەوت، منـیش دیـاری ئـەو هاوڕێیـەم دەردەهێنـا و لاپـەڕەکانیم

هەڵدەدایەوە و تەماشایەکی دەورووبەرم دەکرد نەوەك یەکێ لە ئەندامانی خێزانکەمان بمبینێت و کارێکم بەسەر بێت کە نەخوازراوبێت، رۆژگار تێپەڕین و شوومکرد لە (شەمماس) کە کەنیسەی مەریەمی عەزرایە لە گەڵ یادگاریە تایبەتیەکانمدا ئەم دیاریەشم هەڵگرت، کە قورئانی پیرۆز بوو، شاردمەوە تا دوور بێت لە چاوی مێردەکەمەوە، کە ژیانم بەسەردەبرد لەگەڵیدا، وەك هەر ئافرەتێکی شەریف و بە وەفا و دڵسۆز سێ منداڵم لێیی بوو.

لە دیوانی گشتی پارێزگا دامەزرام، لەوێ ئاشنا بووم بە چەند کچە هاوڕێیەك کە موسڵمان و باڵا پۆش بوون.. یادی هاوڕێ دیرینەکەمم دەکردەوە، هەر کاتێ مزگەوتەکەی بەرامبەرمان بانگی بدایە لە ناخمدا هەستێکی شاراوە دڵمی دادەگرت و بە بێ ئەوەی بزانم هۆکاری چیە، چونکە من هێشتا موسڵمان نەبووبووم و شووم کردبوو بە کەسێك کە پیشەکەشی هەر لە کەنیسەدا بوو، لە پارەی ئەوێ خەرجی خێزانی دەدا.

بە تێپەربوونی کات و بە گفتوگۆی هاورێ و دۆستانەی دۆستە موسڵمانەکانم لەسەر ئاین و ئاکار بیرم لەوە دەکردەوە لە راستەقینەیی ئیسلام و مەسیحیەت و بەراوردم دەکرد لە نێوان ئەوەی کە دەیبیستم لە کەنیسە سەبارەت بە ئیسلام و موسڵمانان و نێوان ئەوەی کە خۆم دەیبینم و دەرکی پێدەکەم، کە بەراستی زۆر پێچەوانەی قسەی قەشە و دەمارگیری مەسیحیەکان بوو.

وردە وردە هەوڵمدەدا ئاشنا ببم بە راستەقینەیی ئیسلام و فرسەتی دیارنەبوونی مێردەکەمم دەقۆزتەوە تا گوێ لە وتاری زانا موسڵمانەکان بگرم لە رێگای رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانەوە... لە ئەنجامدا وەڵامی پرسیارەکانی ناخم بۆ دەردەکەوت و ئەو پرسیارانەی سەراسیمەی کردبووم.

دەنگی (شێخ محمد رەفعەت) سەرنجی راکێشام لەگەڵ دەنگی (عبدالباسط عبدالصمد)و وام هەست دەکرد کاتێ کە گوێم لە دەنگیانەوە دەبوو لە رێگای رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانەوە کە ئەو شتەی ئەوان دەیخوێننەوە هەرگیز وتەی مرۆڤ نیە، بەڵکو نیگایەکی خواییە.

ڕۆژێکیان کە مێردەکەم لە کەنیسە بوو،بە ئەنقەست دەستم برد بۆ دولابەکەم و بە دەستی لەرزۆکەوە گەنجینە بەهادارەکەم دەرهێنا، کە قورئانی پیرۆز بوو، کردەمەوە و بە شلەژاویەوە چاوم کەوتە سەر ئایەتی [إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ] آل عمران/٥٩) واتە: (بەراستی وێنەی دروست بوونی عیسا لای خوای گەورە وەك وێنەی ئادەم وایە، کە دروستی کرد لە گڵ، پاشان پێی ووت: ببە ئەویش بوو).

زیاتر دەستم لەرزی و روخسارم عارەقی دەرکرد و موچڕکەیەك هات بە هەموو لەشمدا و سەرسام بووم، چونکە پێشتر زۆر گوێم گرتبوو بۆ قورئان لە شەقام و تەلەفزیۆن و رادیۆو لای هاوڕێ موسڵمانەکانم، بەلام هەستم بە لەرزین و موچڕکەی ئاوا نەکردبوو، کاتێ هەستم پێ دەکرد لە کاتی خوێندنەوەم بۆ قورئانی پیرۆز بە راستەوخۆیی.

ویستم بەردەوام بم لەسەر خوێنەنەوەکە، بەلام دەنگی کلیلەکانی مێردەکەم کە دەرگای شوقەکەی دەکردەوە پێی بچڕیم و منیش بە خێرایی قورئانەکەم شاردەوە و خستمەوە

شوێنە ئەمینەکەی خۆی و رامکرد بۆ پێشوازی کردن لــە مێردەکەم.

بۆ رۆژی دوایی چووم بۆ سەر کارەکەم و لە مێــشکمدا هەزار پرسیاری بێ وەڵام هەبوو، کە ئــەو ئایەتــە پــیرۆزەی خوێندمەوە سنورێکی دانا سەبارەت بــە سروشــتی عیــسا ئایا کوڕی خوایە وەك قەشەکان بانگەشەی بۆ دەکەن(پــاك و بێگەردی بۆ خوا) یان پێغەمبەرێکی بەرێزە وەك قورئان باسی دەکات؟ ئــەو ئایەتــە هــات تــا گومانەکــە بکــات بەراستی و ئاشکرای بکات، کە عیسا لە پشتی ئادەمــە و کەواتە کوڕی خوا نیە... خوای گەورە دەفەرموێت: [ لَمْ يَلِـدْ وَلَمْ يُولَدْ(٣)وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ(٤)]الاخلاص)

واتە:( کەسی لێنەبو و لە کەسیش نــەبوو و هــەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای ئەو نیە).

سەبارەت بە چارەسەر لە خۆمم پرسی و راســتەقینەیی هەمیشەیم بۆ دەرکەوت... راستەقینەی ئەوەی کە(پەرستراو نیە بێجگە لە خوا و (محمد)یش پێغەمبەری خوایــە) ئایــا ئــەتوانم موســڵمان بــوونی خــۆم رابگــەێنم؟ ئــەی ئــەبێ هەڵوێــستی کەســوکارم چــی بێــت و بــەڵکو هەڵوێــستی هاوسەرەکەم و ئایندەی منداڵەکانم؟!

هەموو ئەو پرسیارانە و پرسیاری تر بە مێشکمدا دەهات و دانیشتبووم لە نووسینگەکەدا و دەموویست کار بکەم، بەلآم نەمدەتوانی، بیرکردنەوە خەریك بوو دەیکوشتم، چونکە پێم وابوو هەنگاونانی یەکەمم دووچاری مەترسیەکی زۆرم دەکات، کەمترینیان کوشتنە لە رێی کەس و کاری مێردم و کەنیسەوە.

بۆ چەند هەفتەیەك لە گەڵ دەروونمدا مامەوە و لە نێو سەرسامی هاورێکانم کە هیچیان پێ نەدەوتم، چونکە منیان بەوە ناسیبوو کە کارمەندێکی چالاکم، بەلآم لەو رۆژەوە نەم ئەتوانی کارێك ئەنجام بدەم، تا زۆرم لە خۆم نەکردایە.

ئەو رۆژە هاتە پێشەوە کە لە هەموو ترس و شتێ رزگارم بوو، لە تاریکیەوە هەنگاوم نا بەرەو رووناکی ئیمان، لەو کاتەدا کە دانیشتبووم، بیرم دەکردەوە و مێشکم جەنجاڵ بوو، بیرم لەوە دەکرەوە کە دەبێت سووربم لەسەری، دەنگی بانگ لە مزگەوتەکەی نزیکمانەوە هاتە بەر گوێم، کە بانگی موسڵمانانی دەکرد کە بێن بۆ دیداری خوای گەورەیان و نوێژی نیوەرۆ ئەنجام بدەن، دەنگی بانگبێژەکە تێکەڵ بە ناخم بوو، هەستم بە حەوانەوەیەکی دەروونی

دەکرد کە بەدوایدا دەگەڕام و هەستم بــە گــەورەیی تــاوانم دەکرد ئەگەر بەو شێوەیە لە سەر بێباوەڕیەکــەم بمێنمــەوە، لە گەڵ ئەو بانگەوازە ئیمانیــەی کــە بــە هــەموو لەشمــدا دەسوڕێتەوە..منیش هەستامەوە ســەر پــێ و بــە بــێ هــیچ پێشەکیەك تاوەکو بــە دەنگــی بــەرز لــە نێــو سەرســامی هاوڕێکانمدا هاوارم کرد: ((أَشْهَدُ أَنَّ لا اِلـه إلا الله وَ أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّدً رَسُولُ الله)) - شایەتی دەدەم کە پەرســتراوی تــر نیــە بێجگــە لــە خــوا و شــایەتی دەدەم کــە محمــد بەنــدە و پێغەمبەری خوایە.

هاوڕێکانم هاتن بــۆ لام و سەرســام بــوون و بــە گریــان و دڵخۆشیەوە پیرۆزباییان لێــدەکردم، منــیش لــە گەڵیانــدا دەستم کرد بە گریان و لەخوا دەپاڕامەوە کە لــە رابــردووی ژیانم خۆش بێت و رەزامەند بێت بە ژیانی نوێم.

سروشتی بوو کە هەواڵی موسڵمان بــوونم بــە دیــوانی پارێزگادا بڵاوبێتەوە و بگاتە گــوێی هاوڕێکــانم و هــاوڕێ مەســـیحیەکانم، ئەوانـــەی (لـــە نێـــوان هەســـتی رق و کینەیاندا) بە خێرایی پەیوەندیان کرد بە خێزانەکــەمان و مێردەکەمەوە و پێیان وابوو کــە لــە پــشت ئــەم بڕیــارەوە چەندین هۆکاری نادیار هەیە.

منیش گوێم نەدایە قسە رقاویەکانیان، چونکە کارەکە زۆر لەو شتە بچووکانە گەورەتر بوو: کە موسڵمان بوونی خۆم بە ئاشکرایی رابگەیێنم، بەڵێ رۆشتم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش لەوێ کاروباری پێویستم ئەنجامدا بۆ راگەیاندنی موسڵمان بوونم.

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بۆم دەرکەوت کە مێردەکەم هەر هەواڵکەی بیستووە خزمەکانی بانگکردبوو، هەموو جلەکانی منی سوتاندبوو، وە هەرچی زێڕ و ماڵ و سامانێکم هەبوو دەستی بەسەردا گرتبوو... هیچ شتێ لەوانە ئازاری نەدام، بەڵام تەنها ئەوەم پێ ناخۆش بوو کە مێردەکەم منداڵەکانمی بردبوو، تا بیکاتە هۆکارێکی زۆرکردن لە من کە بگەڕێمەوە سەر تاریکایی و بێباوەڕی، ئایندەی منداڵەکانم ئازاری دەدام و دەترسام لەناو چوار دیواری کەنیسەدا لەسەر بێباوەڕی (تثلیث) پەروەردە بکرێن و ئایندەیان وەکو ئایندەی باوکیان بێت.

دەستی نزا و پاڕانەوەم بەرز کردەوە تا خوای گەورە منداڵەکانم بۆ بگەڕێنێتەوە و پەروەردەیان بکەم بە رەفتاری موسڵمانانە، خوای گەورەش وەڵامی داواکاریەکەی دامەوە و ژمارەیەك لە خۆبەخشە موسڵمانەکان رێنماییان کردم

کـە فـەرمانی دادگـا بـە دەسـت بێـنم بـۆ بـەخێوکردنی منداڵەکان، بەو پێیەی کە موسڵمانن، منـیش چـووم بـۆ دادگا و بڕوانامەی موسڵمان بوونم پێ بوو، دادگـاش رازی بوو لە سەر هەق، بۆ مێردەکەشـم دوو رێگـام دانـا: یـان موسڵمان بوونی خـۆی رابگەیـەنێت، یـان جیابینـەوە لـە یەکتر، چونکە بە هـۆی موسـڵمان بوونمـەوە دروسـت نیـە خێزانی کەسێك بم کە موسڵمان نەبێت، ئەویش نکولی کرد و رازی نەبوو بێتە ناو ئایینی راستەقینە و بۆیە داگا بڕیـاری جیابوونەوەمانیدا و بڕیاریـدا کـە مـن منداڵـەکان پـەروەردە بکـەم، بـەو پێیـەی کـە موسـڵمانن، چـونکە نەگەشـتبوونە تەمەنی هەرزەکاری و هەروەها لە دایك و باوکەوە موسڵمانن.

وام گومان دەبرد کە کێشەم لەم ئاستەدا تەواو بوو، بـەلاّم لە پڕ مێردەکەم و کـەس و کارەکـەی دەریـانکردم و هـەروەها دەنگۆ و ناوناتۆرەیان بلاّودەکردەوە بە ئامانجی رووخاندنی ورە و دەروونم، ئـەو خێزانـە مەسـیحیانەی دەمناسـین پەیوەنـدیان پچڕاند لە گەڵمدا، لە گەڵ ئەوەشـدا ئـەو خێزانانـە دەنگـۆی ئەوەیان بلاّوکردەوە بـە مەبەسـتی پیسـکردنی کەسـایەتیم و ترساندنی خێزانە موسڵمانەکان لە هاوڕێیەتیکردنم و پچڕانی پەیوەندیان لە گەڵمدا.

لەگەڵ ئەو هەموو تەنگ پێ هەڵچنینانەدا، بەڵام هەر بەهێز و خۆڕاگربووم و لەسەر باوەڕی خۆم و هەموو هەوڵەکانیانم ڕەت دەکردەوە، کە هەوڵیاندەدا پاشگەزم بکەنەوە لە ئایینی ڕاستەقینە.

میش دەستم بەرز دەکردەوە و دەپاڕامەوە لە خاوەنی ئاسمان و زەوی تا هێزم پێ ببەخشێ کە بوەستم بە ڕووی هەموو شتێك کە شایەعەی پێ دەکرێت لە دەروبەرم و خوای گەورە دەرووم لێبکاتەوە.

خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی دامەوە و بێگومان زاتێکی نزیك و وەڵامدەرەوەیە و لە ڕێگای بێوەژنێکی موسڵمانەوە دەرووم لێکرایەوە و لە ماڵ و ساماندا هەژاربوو، بەڵام لە دەرووندا دەوڵەمەند بوو، چوار کچ و کوڕێکی هەتیووی هەبوو، کە دوای وەفاتی مێردەکەی بەجێمابوون، ئەم بێوەژنە موسڵمانە کاریگەر بوو بوو بەو باوەڕ و دۆخە دەروونیەی منی تیادا دەژیام و بەرامبەر بە خۆڕاگری من سەرسام بوو، بە کارێکی گەورەی تەماشا دەکرد... بۆیە پێشنیازی بۆ کردم کە بمخوازێت بۆ کوڕە تاقانەکەی (محمد) تا خۆم و منداڵەکانم لەگەڵ چوار کچەکەیدا بژین.. دوای بیرکردنەوە، زۆری نەخایاند ڕازی بووم و شوومکرد بە (محمد)ی کوڕی ئەو بێوەژنە موسڵمانە.

ئێستا لە گەڵ مێردی موسڵمانم (محمد)دا دەژیم لە گەڵ منداڵەکانم و کەس و کاری مێردەکەم بە خۆشحاڵی و شادیەوە،

هەرچەندە گوزەرانیشمان ناڕەحەتە و هەروەها رق و کینەی مێردەکەی پێشووم و هەڵسوکەوت و مامەڵەی خێزانەکەمان کە مەسیحین.

هەرچەندە من خێزانەکەم ئەو چەرمەسەریەیان بەسەردا هێنام بەڵام من بەردەوام لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە رێنماییان بکات بۆ ئایینی هەق و رەحمەتی خۆی بیانگرێتەوە، وەك چۆن رێنمایی منی کرد و کەوتمە بەر رەحمەت و بەزەییەوە، بێگومان ئەو کارە بەلای خوای گەورە و باڵادەستەوە ئەستەم و نارەحەت نیە.

(مُنْتَدَيات المُسافِر)

## ئای کە ماڵئاواییەکی جوان بوو.

خوشکەکەم روخساری تێك چووبوو، لاوازیش بووبوو.. بەڵام وەك نەریتی جارانی قورئانی پیرۆزی دەخوێند، ئەگەر بگەڕایتایە بە دوایدا لە نوێژگەکەیدا دەتبینی بە کرنووش و سوجدەبردنەوە و بەرزکردنەوەی دەستەکانی بۆ ئاسمان و بە بایانیان و ئێواران و لە نیوەشەودا بەو شێوەیە بوو، سست و بێتاقەت نەدەبوو... منیش سوربووم لە سەر خوێندنەوەی گۆڤارە هونەرییەکان و ئەو کتێبانەی مۆرکێکی چیرۆکیان پێوە بوو.

بە بەردەوامی تەماشای سەتەلایتم دەکرد و خووم پێوەگرتبوو... ئای چەندە زۆرن ئەوانەی خوو بەمەوە دەگرن.. ئەرکەکانم بە تەواوی جێبەجێ نەدەکرد لە نوێژەکانیشمدا رێك و پێك نەبووم... دوای ئەوەی سەتەلایتەکەم دەکوژاندەوە تەماشای فیلمی جۆربەجۆرم دەکرد بۆ ماوەی سێ سەعات بە بەردەوامی تا لە مزگەوتەکەی بەرامبەرمانەوە دەنگی بانگ بەرزدەبوویەوە و منیش دەچوومە سەر جێگاکەم و خوشکەکەم لە نوێژگەکەیەوە بانگی دەکردم

- بەڵێ چیت دەوێت نورا؟

بە دەنگێکی توند پێی دەوتم: نەخەویت تا نوێـژی بـەیانی نەکەیت

- ئۆه... هێشتا سەعاتێکی ماوە بۆ نوێژی بەیانی، ئەوەی من گوێم لێ بوو بانگی یەکـەم بـوو(لـەو وڵاتانـەدا بـە بەیانیانـدا دوو بـانگ دەدرێـت و بـانگی دووەم بـانگی بەیانیە)

- بە دەنگە سۆزدارەکەی... ئا بەو شێوەیە بوو، پێش ئەوەی تووشی ئەو نەخۆشیەشی بێت و لەناو جێگادا بکەوێت.

بانگی کردم..

- ( هەنا ) وەرە لە تەنیشتمەوە دانیشە.

هەرگیز نەمدەتوانی داواکاریی رەت بکەمەوە.

هەستت بە پاکی و راستگۆیەکەی دەکرد

بیگومان بەرهەمی لە خوا ترسانەکەی بوو

+ چیت دەوێت؟

- دانیشە

+ ئەوە دانیشتم چیت دەوێت

بە دەنگێکـی سـازگار و خۆشـەوە وتـی [ كُـلُّ نَفْـسٍ ذَائِقَـةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ]آل عمران/١٨٥) واتە:

(هەموو دەروون و گیانێك مردن دەچێژێ و بەراستی و بە تەواوی پاداشتەکانتان پێدەدرێت لە رۆژی دوایدا)..

بێدەنگ بوو.. پاشان لێی پرسیم :

- ئایا بڕوات بە مردن نیە؟

+ بێگومان بڕوام پێیەتی!!

- ئایا بڕوات نیە کە لە سەر بچوکترین و گەورەترین شت لێپرسینەوە دەکرێت؟

+ بەڵێ... بەڵام خوای گەورە لێبوردە و میهرەبانە و تەمەنیش درێژە، خوشکی خۆم.

- ئایا ناترسیت مردن لە پڕ یەخەت پێ بگرێت؟ تەماشای (هیند) بکە لە تۆ بچوکتر بوو بە رووداوێکی ئۆتۆمبیل وەفاتیکرد... یان فلان و فیسار.. مردن تەمەن ناناسێت و هیچ پێوەریکی نیە!!

بە دەنگێکی ترسەوە (چونکە نوێژگەکەی کەمێك تاریك بوو) وەڵامم دایەوە: بەراستی من لەتارێکی دەترسم و بە هۆی باسکردنی مردنیشەوە ترسەکەم زیادی کرد چۆن ئێستا بخەوم.

من وا گومانم دەبرد کە لەم مۆڵەتەدا گەشت دەکەیت لە گەڵمان، لە پڕ دەنگی گۆڕا و دڵمی هێنایە لەرزین و وتی:

لەوانەیە ئەمساڵ گەشتێکی دوور ئەنجام بدەم بۆ شوێنێکی تر... لەوانەیە (هەنا) گیان... تەمەنەکان بە دەستی خوای گەورەیە... دەستی کرد بە گریان، بیرم لە نەخۆشیە مەترسیدارەکەی دەکردەوە و پزیشکەکان بە نهێنی بە باوکمیان وتبوو: ئەم نەخۆشیەی لەوانەیە زۆر مۆڵەتی پێنەدات، بەڵام کێ ئەمەی بە ئەو ووت یان پێشبینی ئەوە دەکات

- ئەوە چیە بیر دەکەیتەوە... ئەم جارەش دەنگە بەهێزەکەی هاتە بەرگوێم... ئایا پێت وایە بۆیە من وا دەڵێم چونکە نەخۆشم نەخێر؟ لەوانیە تەمەنیشم لە کەسە تەندروستەکان درێژتر بێت.. ئەی تۆ تاکەی دەژیت... لەوانەیە تا بیست ساڵی تر یان چل ساڵی تر پاشان چی؟ دەستی لە تاریکیەکەدا ئەدرەوشایەوە و توند رایدەوەشاند... کەسمان جیاوازیمان نیە، هەموومان دەڕۆین و ئەم دونیایە جێدەهێڵین یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ، ئایا گوێت لە فەرمایشتی خواوە نەبووە کە دەفەرموویت [ فَمَنْ زُحْزِحَ عَنْ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ...] آل عمران/ ١٨٥) واتە: (ئینجا هەر کەس دوور خرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ و بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بە راستی ئەو کەسە سەرکەوتووە)

+ بەخوات دەسپێرم.
بە خێرایی رامکرد و دەنگی لە گوێمدا دەزرنگایەوە
- خوا رێنوایی کارت بێت نوێژەکەت بیر نەچێت.
سەعات هەشتی بەیانی بوو گوێم لە تەقەی دەرگاکەوە بوو، ئەمە کاتی هەستانی من نیە.. گریان و دەنگە دەنگە.. خوایە گیان چی روویداوە، تەندروستی (نورا) تێکچووبوو، باوکم بە پەلە بردی بۆ نەخۆشخانە... [إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ] واتە: (ئێمە موڵکی خواین و هەر بۆلا خۆی دەگەڕێینەوە) ئەم ساڵ گەشت نیە... ئەم ساڵ لە چارەم نووسراوە لە ماڵەوە بمێنەوە دوای چاوەڕوانیەکی زۆر، سەعات یەکی نیوەڕۆ باوکم لە نەخۆشخانەوە تەلەفۆنی بۆ کردین، ئێستا دەتوانن سەردانی بکەن، دەی خێراکەن دایکم هەواڵی پێدام کە قسەکانی باوکم دڵخۆشکەر نین و دەنگیشی گۆڕا بوو، عاباکەم بە دەستەوە بوو.. کوا شۆفێرەکە.. بە پەلە سواری ئۆتۆمبیل بووین.. کوا ئەو رێگەیەی لە گەڵ شۆفێرەکەدا پێیدا تێپەڕ دەبووین.. کورت دیاربوو.. ئەمڕۆ بۆ ئەوەندەی خایاند.. زۆر دوور کەوتووەتەوە، کوا ئەو قەرەباڵغیەی کە دڵی خۆش دەکردم و بەڕاست و چەپدا تەماشام دەکرد، قەرەباڵغیەکی بێزارکەر

بوو، دایکم لە تەنیشتمەوە بوو، دوعای بۆ دەکرد... ئەو کچێکی صالح و گوێڕایەڵ بوو.. هەرگیز نەمدەبینی کاتی خۆی بفەوتێنێت.. لە دەرگای دەرەوەی نەخۆشخانەوە رۆشتینەوە ژوورەوە... ئەوە نەخۆشێکە گیان دەدات و ئەوەشیان تووشی رووداوی ئۆتۆمبیل بووە و سێیەمیشیان چاوەکانی بە قوڵا چوون.

نازانی خەڵکی ئەم دنیایەن یان خەڵکی ئەو دنیا.. دیمەنێکی سەیر بوو، پێشتر نەمبینیبوو... بە خێرایی بە پلیکانەکاندا سەرکەوتین، ئەو لە ژووری چاودێری وورد بوو، پەرەستارەکە وتی: ئێستا دەتان بەم بۆ لای، ئەو باشە و دایکمی دڵنیا کرد کە ئەو دوای ئەوەی کە لە هۆش خۆی چووبوو، ئێستا باشترە.. نەیاندەهێشت لە یەك کەس زیاتر بڕواتە ژوورەوە ئەوە، ئەویٚ ژووری چاودێری ورد بوو، لە ناو قەرەباڵغی پزیشکەکاندا و لە رێگای پەنجەرە بچووکەکەی سەر ژوورەکەوە چاوەکانی (نورا)ی خوشکمم بینی، تەماشام دەکرد و دایکیشم لە تەنیشتیەوە بوو، دوای دوو خولەك دایکم هاتە دەرەوە، کە نەیدەتوانی ئەسرینەکان بشارێتەوە، و رێگاشیاندا بە من بچمە لای و

بەڵام قسەی زۆری لە گەڵدا نەکەم و ووتیـان: دوو خولـەك بەسە بۆ تۆ.

+ نورا گیان چۆنیت.. دوێنێ شەو زۆربـاش بوویـت.. چـی روویدا؟

دوای ئەوەی دەستی گوشیم ووتی:

- سوپاس بۆ خوا من ئێستا باشم

+ سوپاس بۆ خوا، بەڵام دەستت ساردە.

من لە قەراغ قەرەوێڵەکەیەوە دانیشتبووم، دەستم لە قاچی دەدا و دووری خستەوە لێم.

+ داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر بێتاقەتم کردبێت.

- نەخێر بەڵام بیرم لە فەرمایشتێکی خوای گەورە دەکردەوە کە دەفەرموێت: [وَالْتَفَّتْ السَّاقُ بِالسَّاقِ(٢٩)إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ] القيامة/ ٢٩ -٣٠) واتە: (قاچ و لولاق بەیەکدا ئاڵا، راپێچکردن لەو رۆژەدا بۆ لای پەروەدگارتـە) هـەنا گیـان داواکارم دوعـام بۆ بکەیت... چونکە لەوانەیە بەم نزیکانـە پێشوازی لە یەکەم رۆژی (رۆژی دوایی) بکەم.

گەشتەکەم درێژە و توێشووەکەم کەمە.. دوای بیستنی ئەو وتانەی گریاندمی.. فرمێسك لە چاوم کەوتە خوارەوە... هۆشم نەبوو من لە کوێم.. بەردەوام فرمێسك بە چاومدا دەهاتە خوارەوە.

باوکم زیاتر خەمی منی بوو تا نورا، چونکە رانەهاتبوون بەو گریانەی من و مانەوەم لە ژوورەکەمدا...

لە گەڵ ئاوابوونی خۆری ئەو رۆژە غەمبارەدا بێدەنگیەکی درێژ باڵی بەسەر ماڵماندا کێشابوو... کچی خاڵم هاتە ژوورەوە، پاشان کچی مامەکەم... روودانێکی خێرا.. میوانەکان زۆر بوون.. دەنگەکان تێکەڵ بوون.. تەنها یەك شتم دەزانی (نورا مرد) ئەوانەی کە دەهاتن جیام نەدەکردنەوە لە یەکتر و نەم ئەزانی چیان دەوت، خوایە گیان من لە کوێم و چی روو دەدات؟

تەنانەت نەشم دەتوانی بگریم، پاشتر هەواڵیان پێدام کە باوکم دەستی گرتووم کە خواحافیزی یەکجاری لە خوشکەکەم بکەم، منیش ماچم کرد... تەنها یەك شتم دەهاتەوە یاد... کاتێ تەماشامکرد لە سەر پێخەفی مردن راکشابوو، ئەم وتەیەم هاتەوە یاد (وَالْتَفَّتْ السَّاقُ بِالسَّاقِ) ئەو راستیەم بۆ دەرکەوت کە

(إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ) نەمزانی کە ئەو شەوە من گەڕاومەتەوە بۆ نوێژگەکەی.

ئەو کاتە یادی ئەوەم کردەوە کە لە رەحمی دایکیشمدا هاوشانم بوو... چونکە دوانە (جمك) بووین، هاتەوە یادم کە کێ هاوخەممە... هاتەوە یادم کێ بە درێژایی شەو ئەسرین دەڕێژێ و باسی مردن و رۆژی لێپرسینەوەم بۆ دەکات... تەنها خوای گەورە کۆمەکە.

ئەوە یەکەم شەوی بوو لە گۆڕەکەیدا... خوایە گیان رەحمی پێ بکەیت و گۆڕەکەی بۆ رووناك بکەیتەوە و ئەوەش قورئانەکەیەتی و ئەوەش بەرماڵەکەی و ئەوەش...

ئەوەش عەزیزیە گوڵگوڵینەکەیەتی کە پێی دەوتم: دەیشارمەوە بۆ کاتی زەماوەندەکەم... بیرم دەکردەوە و دەرگریام... بیرم لە رۆژە فەوتاوەکانم دەکردەوە... بە بەردەوامی دەگریام.

لە خوای گەورە پاڕامەوە بەزەیی پیامدا بێتەوە و لێم خۆش بێت و بمبورێت.. لە خوای گەورە دەپاڕامەوە کە دامەزراوی بکات لە ناو گۆڕەکەیدا وەك چۆن پێی خۆشەو وەدەیخوازێت...

لە پڕ لە خۆمم پرسی: ئەی ئەگەر من لە جێی ئەی ئەو بمردامایە؟ چارەنووسم چۆن دەبوو؟

لــە تــاو ئــەو ترســە زۆرەی کــە دایگــرتم، نەگــەڕام بــە دوای وەڵامەکەدا، بەکوڵ دەستم کرد بە گریــان... الله اکــبر... الله اکــبر.. بانگی بەیانی هاتە بەر گوێم و بەرز بوویەوە.

بەڵام ئەمجارەیان چەندە ئاوازێکی شیرینی هەیە لام، هەستم بــە دڵئــارامی و حەوانــەوە دەکــرد، کــاتێ کــە بانگەکــەم دەوتــەوە، عەباکــەم لــە خــۆم پیــچاو هەســتامەوە و نوێــژی بــەیانیم کــرد، نوێژێکی پر لە ئەسرین و فرمێسکم کــرد وەك چــۆن خوشــکەکەم پێش من ئەنجامی دەدا، کە دواهــەمین نوێــژی بــوو( ئەگــەر ڕۆژم کردەوە چاوەڕوانی ئێوارە ناکەم و ئەگەر شــەوم کــردەوە چــاوەڕوانی بەیانی ناکەم).

(الزمن القادم).. عبدالملك قاسم

## ئافرەتێکی صاڵحی خواناس حەزی لە چاکەیە؟!

ئافرەتێکی صالّح بوو، حەزی لە چاکە بوو، بێئاگا نەبوو لە زیکری خوای گەورە، هەرگیز رێگای نەدەدا وشەیەکی نابەجێ لە زاری بێتە دەرەوە... ئەگەر باسی ئاگرت بکردایە دەترسا و دەتۆقی و دەستی نزا و پاڕانەوەی بەرز دەکردەوە کە خوا بیپارێزێت و ئەگەر باسی بە هەشتت بکردایە بە ئاواتەوە بوو بۆی و دەستی پاڕانەوەی بەرز دەکردەوە و لە خوای گەورە دەپاڕایەوە کە بیگێڕێت لە خەڵکانی بە هەشت.

خەڵکانی خۆش دەویست و ئەوانیش خۆشیان دەویست و پەیوەندی لە گەڵ دەوروبەریدا هەبوو، لەپڕ هەستی بە ئازارێك کرد لە رانیدا، پەنای بردە بەر شێلان و چەورکردن و باندج بەکارهێنان بەلاّم ئازارەکە زیاتری دەکرد.

دوای سەردانی زۆرێك لە نەخۆشخانەکان و بینینی ژمارەیەك پزیشك مێردەکەی بردی بۆ لەندەن و لەوێ لە نەخۆشخانەیەکی زۆر گەورەدا دوای شیکاری ورد، پزیشکەکان بۆیان دەرکەوت کە گەنینێك لە خوێنیدا

هەیە و بەدوای سەرچاوەکەیدا دەگەڕێن، کە هەر ئەوەش بووەتە هۆی ئازاری رانی... پزیشکەکان بڕیاریاندا کە ئافرەتەکە تووشی شێرپەنجە بووە لە رانیدا، کە رانی سەرچاوەی ئازار و ئەو گەنینەیە و دواهەمین بڕیاریان ئەوە بوو کە پێویستە پەلە بکەن لە بڕینەوەی رانی ئافرەتەکە، تا نەخۆشیەکە تەشەنە نەکات.

لە ژووری نەشتەرگەریدا ئافرەتەکە راکشابوو لە بەردەم قەزاوقەدەری خوادا، بەڵام بەردەوام زیکری خوای دەکرد و ملکەچی خوا بوو، کومەڵێك پزیشك کۆبوونەوە، چونکە نەشتەرگەری بڕینەوەی ران نەشتەرگەریەکی گەورەیە... مۆسەکە خرایە ناو مەقەستەکەوە و بە وردی ئافرەتەکە دانەویەوە و شوێنی بڕینەوەکە دیاری کرا و زۆر بە وردەکارانە و لە نێو ترسێکی زۆردا کارەباکە داگیرسێنرا، هەر کە مقەسەتەکە جولایەوە، گوێزانەکە شکا لەبەر چاوی سەرسام بوونی هەمواندا... ویستیان بە گوێزانێکی تر نەشتەرگەریەکە بکەن، هەمان شت روویدایەوە و گوێزانەکە شکایەوە و بۆ جاری سێیەمیش دیسانەوە گوێزانەکە شکایەوە، کە ئەمە یەکەم جارە لە مێژووی

نەشتەرگەری بڕینەوەدا روودات، کە بووە هۆی سەرسامی هەموو پزیشکەکان کە هەر تەماشای یەکتریان دەکرد.

سەرپەرشتیاری پزیشکەکان هەموویانی بردە تەنیشتێکەوە و دوای راوێژکردنێکی خێرا، پزیشکەکان بڕیاریاندا نەشتەرگەری ئەو رانە بکەن کە دەیانویست بیبڕنەوە... ئای کە شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو !! هەر کە گوێزانەکە گەشتە ناوەڕاستی پێستەکە، پزیشکەکان بە چاوی خۆیان لۆکەیەکی گەنیوی پیسیان تێدا بینی... دوای نەشتەرگەریەکی ئاسان پزیشکەکان شوێنەکەیان پاك کردەوە و تیماریان کرد.

ئافرەتەکەش پاش ماوەیەك بە تەواوی چاك بوویەوە و شوێنەوارەکەشی دیار نەما.. ئافرەتەکە تەماشای رانی دەکرد کە ئاسەواری ئازاری تێدا نەمابوو، بینی مێردەکەی قسە لە گەڵ ئەو پزیشکانەدا دەکات کە هێشتا سەرسامیی بە روخساریانەوە دیار بوو، لە مێردەکەیان دەپرسی: ئایا خێزانت پێشتر نەشتەرگەری لە رانیدا بۆ کراوە؟

پزیشکەکان بۆیان دەرکەوت کە ژن و مێردەکە پێش ماوەیەکی زۆر تووشی رووداوێکی هاتوچۆ بوون و ژنەکە

بە خەستی بریندار بووبوو لەو شوێنەدا... پزیشکەکانیش بە یەك زمان وتیان بەراستی ئەوە چاودێری خوای گەورەیە.

ئای ئافرەتەکە دڵخۆش بوو کە رزگاری بوو لەو کابوسە مەترسیدارە کە بیری دەکردەوە چۆن بە یەك قاچەوە بتوانێت بڕوات بەرێوە... دەستی کرد بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە کە هەستی بە نزیکی و میهر و سۆز و بەزەیی خوای گەورە دەکرد.

خوشکانی بەرێزم ئەم چیرۆکە نموونەیەکە لەو نموونانەی کە لە ژماردن نایەن لە ئەولیاکانی خوا کە پابەندن بە فەرمانەکانیەوە و هەمیشە لە هەوڵدان بۆ رەزامەندیکردنی و دڵەکانیان پڕبووە لە خۆشەویستی خوا.. بەردەوام یادی دەکەن و بێزار نابن تا ئەو رادەیەی زیکر و یادی خوا بوەتە سروودێکی پڕ ئاواز و زمانیان بێتاقەت نابێت لە وتنەوەی.. بەڵکو هەست بە شیرینی و چێژ دەکەن، ئەوانە بە تاسە و شەوقەوە پێشوازی لە فەرمانەکانی خوا دەکەن و بە خۆشەویستیەوە فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن.

خوای گەورەش دەست بەرداریان نابێت و کۆمەکیان دەکات و هاوکاریانە و دەیانپارێزی و دوای ئەوەش ڕەزامەندە لێیان و بەهەشتی خۆی دەبەخشێ پێیان.

## بینایی بۆ کچێك دەگەڕێتەوە لە پەنای کەعبەدا

جارێکی تر بینایی گەڕایەوە بۆ ئافرەتێك کە تەمەنی بیست و حەوت ساڵ بوو، لە پەنای کەعبەی پیرۆزدا، دوای ئەوەی بۆ چەند مانگێك دەچوو کە نابینا بووبوو، بە هۆی کەوتنی لە ماڵەوە و دوای ئەوەی گێژ بووبوو، لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا کە بینایی لە دەستدا بوو، سەردانی چەندین نەخۆشخانەی کردبوو لە سعودیە، بەڵام هەموو پزیشکەکان جەختیان لەسەر ئەوە کردبوو کە کارەکە پێویستی بە توانا و ئارامگرتن هەیە... هەروەها چارەسەرەکەی دەروونی دەبێت و حاڵەتەکەی لە لایەن خێزانەکەیەوە بەدواداچونی بۆ دەکرا لە نێو چەندین نەخۆشخانەدا... هەندێ لە خزمەکانی پێیان دەوت کە بیبات بۆ مەککەی پیرۆز بۆ بەجێهێنای عەمرە و پاڕانەوە لە خوای گەروە کە بینایی بۆ بگەڕێنێتەوە.

رۆژێکیان بە پێی قسەی خۆشکەکەی کە زۆر دڵخـۆش بوو کاتێ کە قسەی دەکرد وتـی: خوشـکەکەم کـاتێ کـە ڕێورەسمی عەمرەی بەجێدەهێنا لە گەڵ خێزانەکەماندا بـە دەوری کەعبەی پیرۆزدا هەستی بە سوڕانەوەی سەری دەکرد و پاشان کەوت بە زەویدا و پاشان کاتێ هاتەوە هۆش خۆی لە ناو حـەرەمی مەککـەدا بینـایی بـۆ گەڕایـەوە، بۆیـە هـەموان زۆر دڵخـۆش بـوون و دەسـتی نـزا و سوپاسـیان بەرزکردەوە بۆ خوای گەورە و کچەکەش سووربوو لـە سـەر ئەوەی چەند رۆژێك لەناو حەرەمدا بمێنێتەوە بۆ نوێژکردن و دوعا و سوپاسی خوای گەروە.

صلاح مخارش- جریده الجزیره

## ئافرەتێك لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا

ئەم چیرۆکە زیاتر لە خەیاڵ و ئەندێشە دەکات... ئەگەر کەسێك بۆی بگێڕامایەتەوە بڕوام پێ نەدەکرد ، لە نوسینگەکەمدا دانیشتبووم، دوای ئەوەی نوێژی عیشام کردبوو لە شەوێك لە شەوە درێژەکانی زستانی (یوجین) لە باکوری خۆرئاوای کیشوەری ئەمەریکا لە ولاتە یەکگرتووەکان، لە مانگی شەوالی ساڵی(١٤١٩)ك لە شاری (یوجین).. من خوێندکار بووم لە زانکۆی(ئۆرجین) ، سەرقاڵی خوێندن بووم لە شەودا کاتی خۆر ئاوا بوون بوو، بێدەنگی باڵی کێشا بوو بەسەر شوێنەکەدا ، تەنها دەنگی کچە بچووکەکەم ئەو بێدەنگیەی دەپچڕان کە خەریکی یاریکردن بوو، دەنگی بارینی باران دەهات، هەرچەندە من حەزم لەو جۆرە دەنگانە نەبوو، چونکە لە ناخمدا سەر لە نوێ چالاکی دەکردم.

کاتێ من بەو شێوەیە بووم گوێم لە زەنگی نەلەفۆنەکەوە بوو کە تێکەڵی ئەو ساتە بێدەنگانە بووبوو، برایەکی ئاینیم بوو کە جەزائیری بوو، ناوی (شەکیب)

بوو، دوای سلاو کردن و ئەحوالْ پرسین، باسی ڕووداوێکی زۆر سەیری بۆ کردم و لە هەمان کاتیشدا دڵخۆش بوو!!!

خێزانی کە ئافرەتێکی ئەمریکی مووسڵمان بوو، ناوی (کەریمە) بوو، خالۆژنێکی هەبوو لە سەر ئاینی مەسیحی بوو، ئەو خالۆژنەی برابوو بۆ نەخۆشخانەی (سیکرت هارت) کە تەنها سێ خولەك لە ماڵی ئێمەوە دووربوو، دوای پشکنینی حاڵەتەکەی پزیشکەکان نەیان توانی حاڵەتەکە بشارنەوە، ئافرەتەکە ئەستەم بوو بژی ... دەبوایە هەر کۆچی دوایی بکردایە، کارەکە تەنها سەعاتێك یان دووان یان کەمتری ماوە و خوای گەورە خۆی زاناترە بەوە.

پاشان بۆی باسکردم کە چی بە سەر خۆی و ژنەکەیدا هاتووە، منیش لە سەرسامیەکی تەواودا بووم، گوێم لە سەدای دەنگی دەگرت، وەك ئەوەی هەست بە لێدانی دڵی بکەم، بە یەك پیت پێی وتم:

لە گەڵ ژنەکەمدا قسەم کرد سەبارەت بە حاڵی خالۆژنی... ڕاوێژمان کرد کە جارێکی تریش هەوڵ بدەینەوە و بانگی بکەین بۆ موسڵمان بوون، هەرچەندە تەمەنی چەند سەعاتێکی ماوە، مادام هێشتا لە غەرغەرەی مردندا نیە.

هاوڕێکەم وتی: پشتم بەست بەخوای گەورە و دوو رکات نوێژم کرد و بانگم کرد بۆ لای خوای گەورە بۆ رێنوێنی، کاتێ کە لە سوجدەدا بووم، خوای گەورە سینەی بکاتەوە بۆ رێنمایی هەق و راستی، چونکە دەمزانی ئادەمیزاد کاتێ سوجدە دەبات نزیکترین ساتیەتی لە خوای گەورەوە.

پاشان (کەریمە) رۆشت بۆ نەخۆشخانە بۆ لای و داوای لێکرد کە موسڵمان بێت و هەواڵی پێدا کە ئیسلام وەڵامی ئەو کەسە دەداتەوە و قبوڵی دەکات و خوای گەورە لە هەموو رابردووی خۆش دەبێت و ئافرەتەکە وتی بڵێ (أَشْهَدُ أَنَّ لا اله إلا الله وَ أشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله) بە متمانەیەکی تەواوە و لە ناخی دڵیەوە، هەرچەندە ئەو ئافرەتە نەخۆشە توانای قسەکردنیشی لەدەست دابوو... خێزانی هاوڕێکەم بە شێوازێکی جوان داوای لە خاڵۆژنە نەخۆشەکەی کرد کە شایەتومان بێنێت و هەرچەندە نەیشی دەتوانی بە زمان بیڵێت، ئەگەر بیەوێت ئەوە بە دەستی ئاماژە دەکات بۆ ئەوە.

دوای ئەوە ماناکەی بە زمانی ئینگلیزی بۆ روون کردەوە وتی پێی(أَشْهَدُ أَنَّ لا اله إلا الله وَ أشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله) پاشان ئەوە حاڵەتێکی قورس بوو بۆ کەریمە،

چەندە ئاواتەخواز بوو کە خالۆژنی رزگار بکات لە ئاگرێك کە مرۆڤ و بەرد تاوی دەدات، لەگەڵ لێدانی دڵی خێرایدا و چەند چرکەیەکی هێواش تێپەڕین کە قورس بوون، قورسیەکەی تەنها لە بزواندنی دەستی ئافرەتە نەخۆشەکەی دەکرد کە وردە وردە دەستی بەرز کردەوە و دوای ئەوەی گوێی لە تەڵقینی شایەتوومان بوو زیاتر بەرزیکردەوە کە جاران نەیدەیتوانی، بە خەندە و رەزامەندیەوە باوەڕی خۆی راگەیاند و ئایینی ئیسلامی قبوڵ کرد.

(کەریمە) خەریك بوو لە خۆشیدا شاگەشکەی دەکرد، ئینجا مژدەی پیرۆزیی لە روخساریدا دەرکەوت و سورەتی (یس)ی خوێند بەسەریدا و ئافرەتە نەخۆشەکەش لەکاتی گوێبیستی قورئانەکەدا خەندە و خۆشی لە روخساری دەبینرا، کە بە تەواوی رەزامەندە لەو قورئانە پیرۆزەی کە بە سەریدا دەخوێنرێت.

پەرەستارە ئەمریکیەکەش کە ئاگاداری رووداوەکە بوو بە بێ ئەوەی کەس هەستی پێبکات، پێشنیاری کرد کە وەك خۆبەخش بە فەرمی دەبێتە شایەت لە سەر موسڵمان بوونی خالۆژنی کەریمە ئەگەر پێویستی کرد، خوای گەورە

**هێنایە گۆ کە توانای بە گۆخستنی هەموو کەسێکی هەیە (أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ) لاالـه الله.**

**(شەکیب)ی هاوڕێم پرسیاری لێکردم: کە پێویستە چی بکەین بەرامبەر ئەو ئافرەتە کە هێشتا زیندووە و لە ژیاندایە.**

**لە وەڵامیدا وتم: ئەو ئێستا خوشکی موسڵمانی ئێمەیە و بەو پێیەی کە خۆی موسڵمان بوونی ڕاگەیاند، لە کاتێکدا کە لەوپەڕی سەرسامیدا بووم و دڵم لە خۆشیدا خەریك بوو دەفڕی، بە هۆی موسڵمان بوونی ئەو ئافرەتەوە کە نەخۆشیی زۆری بۆ هێناوە و پزیشکان بێئومێد بوون لە چاکبوونەوەی، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ مم بیر خستەوە کە بوخاری و موسلیمﷺ گێڕاویانەتەوە وتی: پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر فەرمووی** [إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ يكَتْبِ رِزْقِهِ وَأَجَلِهِ وَعَمَلِهِ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ فَوَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ

حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا].متفق عليه

**واتە: هەریەکە لە ئێوە لەماوەی چل رۆژدا لە سکی دایکیدا دروست دەبێت، پاشان لەماوەی چل رۆژدا دەبێتە پارچەیەك گۆشت و خوێن، پاش ماوەی چل رۆژیش دەبێتە پارچە گۆشتێك.. پاش ئەوە خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت و رۆح دەکات بەبەریدا و فەرمانی بە چوار پێ دەکرێت، بە نووسینی رۆزیی، و درێژیی ژیانی(ئەجەلی)و کاری،بەدبەختە یان بەختەوەر، سوێند بەوەی جگە لەو خوایەکی کە نیە، کەسی واتان هەیە کار و کردەوەی بەهەشتی دەکات، تا لەنێوان ئەو و بەهەشتا ئەندازەی گەزێك دەمێنێت، کەچی نوسراوەکە پێشی دەکەوێت و کارو کردەوەی دۆزەخی دەکات و دەچێتە دۆزەخ، هەروەها کەسی واشتان هەیە کاروکرداری دۆزەخی دەکات، هەتا بە ئەندازەی گەزێکی دەمێنێ و نووسراوەکە پێشی دەکەوێت و کار و کردەوەی بەهەشتی دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە.**

**پاشان سەماعەی تەلەفۆنەکەم دانایەوە و بۆ ساتێك وەستام، پاشان دەستم خستە ژێر چەناگەمەوە، هەر ئەوەندەم زانی زۆر بە پەرۆشەوە دەستم کرد بەگریان، ئەوانەی دەوروبەریشم هەروا بوون، کاتێك کە بەسەرهاتی ئەو شەوەم بۆ**

گێڕانەوە و ساتانێکی خۆشی پڕ لە ملکەچی و فرمێسك بوو، سوپاسی خوای گەورەمان دەکرد... تەهلیلە و تەسبیحاتمان دەکرد بە هۆی ئەو فەزڵەوە کە بەخشیبووی بەو ئافرەتە بۆ ڕێنمایی کردنی... هاوڕێکەم کاتێ کە لە مزگەوت بینیم دوای ئەو ڕووداوە دەیووت: هەر چەندە یادی ئەو دیمەنە دەکاتەوە هەستێکی سەیر دایدەپۆشێت و هەست بە لەرزین دەکات، پاشان هیچ شك نابات ئەوە نەبێت کە زیاتر حەز لە نوێژکردن و سوجدەی درێژ و مانەوە لە مزگەوتدا دەکات.

ڕاوەستن بەسەرهاتەکە هێشتا تەواو نەبووە، لە هەمان شەودا کە ئەو ئافرەتەی تێدا موسڵمان بوو، چەند سەعاتێك تێنەپەڕی بەسەر قسەکانماندا دوای ئەوەی هەواڵم بە هاوڕێکەمدا بە تەلەفۆن کە پێویستە ئافرەتەکە نوێژی مەغریب و عیشا ئەنجام بدات بە چ شێوەیەك دەتوانێت؟ ئەویش هەواڵی پێدام کە ئەجەلی نوسراوی پێش هەموان کەوت... گیانی پاکی بە موسڵمانی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری... کاتێ کە ڕازی بوو خوای گەورە پەروەردگاری بێت و ئیسلام ئایینی بێت و محمدیشﷺ پێغەمبەری بێت و یەك نوێژی بۆ خوا ئەنجام نەدا.

خوایە گیان بۆ خاتری گەورەیی ئەم ئیسلامە دەپاڕێینەوە لێت کە ڕەحمی پێ بکەیت و ئەو تەوبەیەی بە باشترین شێوە

لێ قبوڵ بکەیت، خوایە گیان عاقیبەت خێریی دەخوازین لە تۆ ئەی بەبەزەییترینی بەبەزەییان.

(مجله البیان)

## مەینەتیەکانی سارە

ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە لەواقیعی ئازاراویماندا ڕوویداوە، ئەوەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە بەسەر خۆیدا هاتووە.. تەنها فرمێسك بەس نیە، هەزار جار مردنیش یەکسان نیە بەیەك (ئاە) کەلەناخی بریندار و دڵی دەردەدارەوە بێتە دەرەوە.. ئێستە من زانیومە کە (بەختیار ئەوکەسەیە پەند لە کەسی ترەوە وەربگرێت، وە سەرکەشیش ئەو کەسەیە کە خۆی بکات بەپەند).. ئافەرین بۆ ئەو کەسەی ئەوەی ووتوە و ئەوەی کە کاری پێ دەکات..

ئەوە ئازارەو ئەوە پەشیمانیە لەسەر هەموو ساتەکانی ژیان، هەرکە ڕۆژێکی نوێ دەست پێدەکات ئازارەکانی

منیش دەست پێدەکات.. هەموو ساتێك بەڵکو هەموو چاوتروکانێك هەموو شتێك لە دڵمدا دەسوتێ..

ڕۆژانە زۆرجار بەڵکو هەزارەها جار دەمرم.. کەسیش پێم نازانێت و کەسیش ئاگای لێم نیە تەنها خوای گەورە نەبێت، من هەموو شتێ کە بنیاتنرابوو بۆی ڕووخاندم و ئازیزترین شتێ کەهەیبوو تێکمدا.. بەڵێ بەم دوو دەستە تاوانبارە پیسە نەفرەت لێکراوە.

خوایەگیان بیرکردنەوە چەندە سەختە.. خوایەگیان دەردیسەری چەندە نارەحەتە، لەهەموو بەرەبەیانێکی نوێدا ئازارەکە و ماتەمیەکە لەهەر سوچێك لە سوچەکانی ئەم ماڵەدا نوێ دەبێتەوە.. لەناخمدا هاوار دەکەم ئەگەر دەری ببڕم ئەوە دیوارەکانی بەردەمم دەڕوخێن و دەسوتێن..

ئەگەر شەو باڵ بکێشێت بەسەر ئاسمانی ڕۆژدا و دایپۆشێت، و شەوی نهێنیەکان دەست پێبکات ئەوەی کە عاشقان بەدوایدا دەگەڕێن، و گۆرانیبێژان گۆرانی بەسەردا دەڵێن و شەونخونیکەران پەشیمانن لەسەری، هەزارجار دەگریم و هەزار جار ئاخ هەڵئەکێشم چونکە زیندووم و

تائێستا ئەژیم، دەمەوێ بمرم بەڵام ناتوانم، لەوانەیە بەهۆی ئەوەوەبێ ترسنۆکم یان نامەوێ هەڵەکە دووجار دووبارە بکەمەوە، بەڵکو خوای گەورە لێمخۆش بێت لەوەی کە لەژیانی ڕابردوومدا کردوومە بەڵکو لەتاڵاوی ڕابردووە، زۆرێك لەزەت لەڕابردوو و یادگاریەکانیان دەبینن و حەز دەکەن باسی بکەن تەنها من نەبێ، دەزانن بۆ..؟

نامەوێ پێتان بڵێم چونکە دەترسم نەفرەتم لێ بکەن، و دوعام لێبکەن زیاتر لەپاڕانەوەکانم و نەفرەتکردن لەخۆم، لەوانەیە پیاوچاکێکتان تێدابێت دوعاکەی گیرابێت و خوای گەورەش بەهۆی دوعاکەی ئەوەوە سزام بدات و بە نەفرەتی خۆی نەفرەتم لێ بکات.. ببوورن ئەگەر قسەکانم ناڕێك بن و ڕێك نەخرابن.. چونکە من دەردەدارم، هەر نارەحەتیەك کە سەرپەرشتیم کردووە نارەحەتیەك بووە بەڵکو دوان بەڵکو سیان بەڵکو زیاتر، من ئەو کەسەبووم هەموو شتێکم فرۆشت و هیچیشم دەست نەکەوت.. سوێند بەخوا بەسەرهاتی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە تەنها لەبەر ئەوەی هۆشیارتان بکەمەوەو ئاگادارتانکەم، ئاگادارتانکەم

تا نەکەونە ئەو حاڵەتەوە کە من تێیکەوتووم، سوێند بەخوا خامەکەم شەرم دەکات لەوەی کە من دەمەوێ بینووسم، و پەنجەکانم هەزار جار دەیانەوێ ڕێگام لێبگرن بەڵام من هەر بەسەرهاتی خۆم دەنووسم، بەڵکو بەهۆیەوە خوا چاکەم بۆ بنوسێت و بێتە توێشووم لەڕۆژی دواییدا.. لۆمەم مەکەن و گوێ لەبەسەرهاتم بگرن و حوکم بدەن و پەند و ئامۆژگاری وەربگرن پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ.

من لاوێکی گوزەران باش بووم لە خێزانێکدا کە خوای گەورە ڕەوشت و ڕۆزیی و چاکەو پیرۆزیی بۆ نووسیبوو، لەوکاتەوەی کە گەورەبووین پێکەوە دەژیاین و یەك ماڵ گلێری کردبووینەوە کە پڕبوو لە بەختەوەری و پێکەوە ژیان و خۆشەویستی، لەماڵەوە دایکم و باوکم و دایکی باوکم و براکانم کە شەش برابوون و من حەوتەمیان بووم و لەهەموویان گەورەتر بووم.. دووەمیش بووم لەناو هەموویاندا، چونکە خوشکێکم ساڵێك لەمن گەورەتر بوو.. من دوای باوکم پەروەرشیاری دووەمی ماڵەوە بووم، هەموان زۆر پشتیان پێ دەبەستم.. بەردەوام بووم لەخوێندن

تاگەیشتمە دووی ناوەندی ..خوشکەکەشم لەسێی ناوەندی بوو.. هەموو خوشك و براکانی ترم بەردەوام بووین.. ئاواتەخوازبووم ببمە ئەندازیار، بەڵام دایکم حەزی دەکرد ببمە فڕۆکەوان.. باوکیشم لەگەڵ مندابوو دەیەویست ببمە کەسێکی زانکۆیی و پسپۆڕبم لەهەر بوارێکدابێت.. خوشکەکەم دەیەویست ببێتە وانەبێژ تا ئایین و ئەدەب فێری نەوەکان بکات...

بەڵام ئای لە ئاوات و خەونەکان و ئومێدەکان.. چەندین کەس پێش ئەوەی خەونەکانیان بێتە دی لەژیاندا نەمان، چەندین کەس بێتوانابوون لەهێنانەدی خەونەکانیان بەهۆی بارودۆخی خۆیانەوە، و چەندین کەسیش خەونەکانیان هێناوەتەدی، بەڵام بەهەرحاڵ ئێمە خەونەکانمان نەهاتە دی بەشێوەیەك کە بڕوا ناکرێت و بەبیروهۆشی نە عاقڵ نەشێت نەهیچ کەسێکدا نایەت.

لەقوتابخانەکەم ئاشنابووم بە کەسانێك قسەکردنیان و هەڵسوکەوتیان وەکو هەنگوین وابوو بەڵکو بەتامتریش... چەندین جار هاوڕێیەتیم کردن و بەدزی کەس و کارم

چەندجارێ لەگەڵیان دەبووم، خوێندنەکەشم بەردەوام بـوو، حاڵەتیـشم لەوپـەڕی باشـیدابوو، مـن هـەوڵی زۆرم دەدا تاوەکو هاوڕێکانم و خوێندنم پێکەوە گرێ بدەم.. لـەنیوەی یەکەمدا توانیم وابکەم.. پاشان مۆڵەت دەستی پێکرد ئای لەچ مۆڵەتێك، خوای گەورە نـە مۆڵـەتی واو نـە ڕۆژی وا نەگێڕێتەوە... باوکم هەستی کردبوو چوونە دەرەوەم زیادی کردووە و کەمتر گرنگی بـە ماڵـەوە دەدەم، بۆیـە لۆمـەی کردم و لۆمەی دایکیشمی کرد.. بەڵام خوشکەکەم بەرگری لێدەکردم، چونکە زۆر منی خۆش دەویـست لـەوە دەترسـا باوکم لێم بدات، چونکە لێدانەکانی سەخت بـوون ئەگـەر تـوڕە ببوایـە، ڕۆژانـی پـشوو گوزەشـتیان دەکـرد لەگـەڵ شەوەکانیدا، ئەگـەر بمزانیایـە چـۆن کۆتـایی دێـت خـۆم دەکوشتەوە بەڵکو جەستەم پارچە پارچە دەکرد و بـەردەوام نەدەبووم، بەڵام ئەوە ئیرادەی خوایـە... مـن و هاوڕێکـانم لەپشتەوەی ماڵی یەکێ لە هاوڕێکانمانـدا بـووین، بـانگی کردبووین بۆ بینینـی ڤیـدیۆو یـاریکردن پێکـەوە، بۆیـە لەمەغریبـەوە دانیـشتین تـاوەکو سـەعات یـانزەی شـەو،

ئەوکاتەش کاتی گەڕانەوەم بوو بۆ ماڵەوە لەو ڕۆژانەدا، بەڵام خاوەن ماڵەکە داوای لێکردم کە بۆ نیو سەعاتی تر دانیشم، پاشان هەمووومان بچینەوە بۆ ماڵی خۆمان، ئایا دەزانی نرخ و بەهای ئەو نیوسەعاتە چەند بوو، بەهای تەمەنم بوو، نەخێر بەهای من و باوکم و دایکم و هەموو خێزانەکەم... بەڵێ هەموویان، ئەو نیوسەعاتە بەهای هەموو ژیانمان بوو، بەهای گواستنەوەمان بوو لەبەختەوەریەوە بۆ بەدبەختی هەتا هەتایی، بەڵکو ئەو نیوسەعاتە خۆم ئامادەکرد تا بگوێزمەوە بۆ ئاگرێك داخمان کات، تەنها بۆ کەسێکە کە بەدبەخت بێت، داوای لێبوردنتان لێ دەکەم چونکە لەباسەکەم چوومە دەرەوە.. یەکێ لە هاوڕێکان خۆی تەرخان کرد قۆریەك چا ئامادەبکات تاوەکو کاتی پێوە بەرینە سەر.. چاکەی هێناو خواردمانەوەو قسەمان دەکرد و شۆخی و سوعبەتمان دەکرد، بەوپەڕی بەرائەت و نیەت پاکیەوە، بەڵام دوای ئەوەی چاکەمان خواردەوە وامان لێهات بەلادا دەکەوتین و پێدەکەین و دەڕشاینەوە بەهەموو شێوەیەك، هەموومان

بەڵێ هەموومان... ئاگام لێ نەمابوو چیمان لێهاتووە، تاوەکو یەکەمین کەسمان کە بە ئاگاهاتەوە ئێمەشی بە ئاگا هێنایەوە.. خاوەن ماڵەکە هەستاو لۆمەو سەرزەنشتی کردین لەسەر ئەو کردەوەیەمان، ئێمەش هەستاینەوە و نەماندەزانی چی ڕوویداوەو بۆچی و چۆن ئەمە ڕوویدا، سەرزەنشتی ئەوەمان کرد کە چاکەی ئامادە کردبوو، ئەویش لەوەڵامدا ووتی: ئەوە شۆخیەك بوو کردمان، خۆمان و شوێنەکەمان پاك کردەوەو چوینەوە بۆ ماڵەوە..

لەگەڵ جریوە جریوی چۆلەکەدا گەشتمە ماڵەوەو هەموو خەوتبوون تەنها ئەو خوشکەم نەبێ کە بردیمە ژوورەکەی خۆیەوەو ئامۆژگاری و هەڕەشەی لێکردم کە ئەمە کۆتاهەمین جاربێت دوابکەوم لە ماڵەوە.. منیش پەیمانی ئەوەم پێدا، ئەو هەژارە نەی دەزانی کە ئەمە پێشتر هەڕەشەیە بۆ ژیانی ئەو نەك من.. خۆزگە نەبورایە لێم و لێیبامایە بەڵکو بیکوشتمایە.

دوای چەند ڕۆژێ لەلای هاوڕێیەکمان کۆبووینەوە... داوای ئەو شۆخی و سوعبەتەمان کردەوە چونکە حەزمان

لێدەکرد و عاشقی بووبووین.. هاورێکەمان پێی ووتین کە ئەوە گرانە و بەنرخێکە کەس ناتوانێ بەتەنها بیکرێت.. بۆیە پارەمان کۆکردەوە و بەپێی ژمارەی خۆمان کەپسولەکانمان کڕی.. واگومان دەبەم ئێستا بزانن ئەو شتە چییە.. مادەی هۆشبەر.. شۆخی و سوعبەت بوو ..بە دنکە حەبێکی مادەی هۆشبەر و ئێمەش نەمان دەزانی.. هەندێکمان بەهۆی ئەو گاڵتەو پێکەنین و ئەو دەنکە حەبە بەرەو سەرگەردانی ڕۆشتین..

ڕێکەوتین لەسەر کاری نۆبە.. بەدوو هەفتە جارێ یەکێکمان پەیدای کات و پارەکە کۆبکەینەوەو حەبەکان بکڕین.. ڕۆژان گوزەران و بارودۆخم لەخوێندنگا بەرەو خراپی چوو.. بۆیە باوکم گواستمیەوە بۆ قوتابخانەیەکی ئەهلی بەڵکو سەرکەوتوو بم و دواناوەندی تەواو بکەم، خەونەکانی من و ئەویش و خەونی دایکیشم بوون بە هەڵم.. فڕۆکەوان چ فڕۆکەوانێك چ ئەندازیارێك لەمن دەخوازرێت.. سوێند بەخوا تاوانی من نەبوو، وە نەمئەزانی.. ئەگەر کارەکە پێشنیار بکرایە بۆم ڕەتم

دەکردەوە و سەری خۆم هەڵدەگرت بەڵام گاڵتەو سوعبەت بوو..

نەفرەتی خوا لەو کەسەی ئاوا گاڵتەو شۆخی دەکات بەلاوانی موسڵمان.. ڕۆژان دەگوزەران و ئێمەش بەردەوام لەسەر ئەو حاڵە کۆدەبووینەوە، کەس نەیدەزانی و کەس هەستی نەدەکرد چی ڕوودەدات.. وام لێهاتبوو نەمدەتوانی دوور کەومەوە لێی نە لەمە نە لە هاوڕێکانم.. ئەنجامی کۆتایی ساڵمان وەرگرتەوە کە چاوەڕوان نەکراو و کارەسات بوو بۆ هەموو کەس و کارم.. بەڵام ئەوەی کە هێوری کردینەوە خوشکەکەم بوو کە دەرچوو بوو بە پلەی (تقدیر عالی).. پیرۆزبێت.. لەناخی دڵمەوە ووتم هەرچەندە من ئەوەشم بەسەرداهاتبوو.. ووتم و بۆیەکەمجار و بۆ دواهەمین جار لەناخمەوە هەستم بە خۆشی کرد.. ووتم پێی: چیت دەوێ بۆت بکڕم بەبۆنەی سەرکەوتنتەوە.. ئەزانی: ووتی چی.. وەك ئەوەی لەگەڵ من و هاوڕێکانم ئامادەی دانیشتنەکانمان بوبێت، وەك ئەوە بەحاڵمان بزانێت.. وتی:

دەمەوێ ئاگات لەخۆت بێت برای بەڕێزم.. تۆ دوای خوای گەورە پشت و پەنای منی.

ئەو ڕۆژە چەند ووشەیەکی ووت نەیزانی دەبێتە یادەوەریەك بۆ من بەدرێژایی ژیانم سەختتر لە لۆمەکردن.. خۆزگە وای نەوتایە و خۆزگە منیش پرسیارم لێنەکردایە..

چ کۆمەك و پشتیوانیەك لەمن داوا دەکەیت (خوای گەورە باشترین پشتیوان و بریکارە)

(حسبي الله ونعم الوكيل) خوشکەکەم چووە پەیمانگای مامۆستایانی کچانەوە وتێدەکۆشاو هەوڵی دەدا... منیش دەکەوتم و دەکەوتم... لە سەرەڕۆیی و تاریکیەوە بۆ سەرەڕۆیی و تاریکی.. لەخراپەوە بۆ خراپتر.. بەڵام کەسووکارم نەیاندەزانی و ئێمەش زیاتر سەرەڕۆ بووبووین.. تا ئەو ڕادەیەی نەماندەتوانی زیاد لە دوو ڕۆژ دەستبەرداری ئەو حەبە ببین.. هاوڕێیەکم بەڵکو دوژمنێکی نەفرەت لێکراو بەڵکو شەیتانی نەفرەت لێکراو پێی وتین شتێکی تر هەیە خۆشتر و بەتامتر و درێژخایەنترو بەختەوەرترە، گەڕاین بەدوایدا.. دەستمان کەوت.. بۆیە پارەیەکی زۆرمان

بۆ گلێر کردەوە.. هەموو ئەمانە لـەگیرفانی باوکمـان کـە نەماندەزانی ئەوانیش بەشدارن لەفەوتانی ئێمـە یـان نـا.. ئایا تاوانبارن یان نا؟!

جارێکیان کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە خوشکەکەم هەسـتی بەحاڵەتی مـن کـرد و گومـانی لێ پەیـدا کـردم، و وازی لێهێنـام بخـەوم، بـەیانی هـات و لەژوورەکەمـدا قـوت بوویەوەو ئامۆژگاریی کردم و هەڕەشەی لێکردم کە باسـی دەکات ئەگەر ڕاستی پێ نەڵێم...

دایکم هات بەسەرداو ئێمـەش قـسەکانمان بـڕی، دایکـم ناردمـی چەند پێداویستیەکی بۆ بێنم، منیش چـووم و وام لێهاتبوو لە خوشکەکەم ڕامـدەکرد لەترسـی ئـەوەی ئـەو شتەی کەساڵێکە بەپەنهانی دەیکـەم ئاشـکرابێت.. قـسەم لەگـەڵ هاوڕێیەکمـدا کـرد ، پێکـەوە چـووین بـۆ مـاڵی هاوڕێیەکی ترم.. بڕێـك تاوانمـان بـارکرد.. ڕوداوەکـەم بـۆ باسـکردن.. ئێمـەش ترسـاین لـە ئاشـکرابوونی و قـسەی خەڵکی.. بۆیە بیرمانکردەوە بەڵکو شـەیتانەکانمان بیریـان کردەوەو یەکێکیان پێی ووتم: چارەسەرم لەلایـە.. چارەسـەر

چیە.. ئایا دەزانی.. ئەگەر لە شەیتانم بپرسیایە هەرگیز ئەوە بەخەیاڵیدا نەدەهات.. ئایا دەزانی چی ووت؟ ئایا دەزانی؟

چۆن بیری کردەوە... کەس گومان نابات چی ووتبێت!! ئایا ووتی بیکوژین؟ خۆزگە وای بوتایە.. ئایا ووتی بیسوتێنین؟ نەخێر بەڵکو لەوە خراپتر.. ئایا دەزانی چی ووت؟؟

حسبی الله ونعم الوکیل.. خوای گەورە باشترین پشتیوان و بریکارە دژی ستەمکاران و بێهۆشان، وە ئەوانەی دەیکڕن و دەیفرۆشن، خوا پەنامان بدات لەو هاوڕێیەم و خوا پەمانان بدات لە منی نەفرەت لێکراو.. خوایەگیان ئێسکەکانی هەپرون هەپرون کەیت و چاوی کوێرکەیت و عەقڵی لەدەست بدەیت.. خوایەگیان نەلە دنیاونە لەقیامەت ڕێنموونی نەکەیت..

ئایا دەزانن چی ووت.. خراپەو زوڵم و داوێن پیسی و دوژمنایەتی هات بەزاریدا..

ووتی: باشترین ڕێگا ئەوەیە بیهێنینە ڕیزی خۆمان و حەبێکی بدەینێ، ئەوکاتە ناتوانێ کارەکەمان ئاشکرا

بکات... بەڵام من ڕازیی نەبووم ئەو خوشکێکی شـەریف و داوێن پاك و خۆشەویست و نازداری من بوو.. خوشکم بوو.. بەڵام وەسوەسـەیان خـستە دڵـمـەوە.. وە ووتیـان ئـەو هـیچ زیانێکی پێناگات.. حەبەکەی بۆ دەبەیت بـۆ ماڵـەوەتان و زۆر بەڕێزەوە ئەو لەماڵی خۆیاندایە.. و تەنها حەبێك.. تـۆ باش دەزانیت ئەوەندە کاریگەرىی نابێت..

لەژێر کاریگەریی مادەی هۆشبەرداو لەژێر کاریگەریی شەیتانەکانیداو شەیتانی خۆم ڕازیی بووم.. هەموو شتێکم لەگەڵیاندا ڕێکخست.. چوومەوە بۆ ماڵـەوە.. خوشـکەکەم قسەی لەگەڵ کردم داوای لێکردم پێکـەوە قـسە بکـەین.. منـیش ووتم چـایەك ئامـادە بکـەو مـن دان بـە هـەموو شتێکدا دەنێم.. ئەو داماوە هەستایەوە تاوەکو چـا ئامـادە بکـات، هــەموو ئومێـدێکی ئـەوەبوو کـە کێـشەی مــن چارەسەر بکـات.. منـیش لەمێـشکمدا هـەزار شـەیتانی وەهمی هەبوو.. پێویستە هەموو ژیانی دارمێنم.. چایەکەی ئامادەکرد و هێنای.. منیش ووتم: چایی بـۆ خـۆم و خـۆت تێکە، پاشان پێم ووت: پەرداخێ ئاوم بـۆ بێنـە.. هەسـتاو

ڕۆیشت.. کاتێ لە ژوورەکە چووە دەرەوە سوێند دەخۆم بە خوای گەورە بەبێ ئەوەی هەست بکەم فرمێسک بەچاومدا هاتەخوار..

نازانم فرمێسکی خەفەتباریی بوو بۆ ئایندەی خوشکەکەم.. نازانم ڕۆحم بوو لەچاومەوە دەرچوو.. نازانم ویژدانم بوو، نازانم فرمێسکی شادومانی بوو کە من بەوەفام بەرامبەر بەو پەیمانەی داومە بە هاوڕێکانم و ئەو نهێنیەم بۆ هەتا هەتایی پاراستووە.

حەبێکی تەواوم خستە چاکەیەوە.. خوشکەکەم بەخەندەوە گەڕایەوە.. منیش دەمبینی لەبەردەمدا وەك کاوڕێکی بچوك لەناو دارستانێکی پڕ لە گورگدا بەهەموو نیازێکی پاك و دڵگەشەوە.. فرمێسکەکانی منی بینی.. سڕینی و ووتی پیاو نابێ بگری.. هەوڵیدا دڵم بداتەوەو لێپرسینەوەم بکات..

ئەوەی من بیزانم بۆ ئەو دەگریام نەك خۆم، بۆ دوارۆژی.. بۆ پێکەنینەکەی.. بۆ چاوەکانی.. بۆ دڵە سپیە پاکەکەی.. شەیتانی ناخی منیش دەیوت: ئارامبەر.. زیانی پێ

ناگەیەنێت.. سبەینێ چارەسەری خۆت و خوشکەکەت دەکەیت.. ئەو پێویستە دەردو ئازاری تۆ بزانێت و بژی تیایدا.. و بە ئازاری تۆ نازانێت تاوەکو تاقی نەکاتەوە..

بۆیە خەریکی جوانکردنی خراپە و تاوان و داوێن پیسی بوو بۆ من.. حسبی الله.. پێم ووت: باجاری چاکەمان بخۆینەوە تاوەکو کەمێك هێمن ببمەوە، پاشان باست بۆ دەکەم.. ئەو چاکەی خواردەوە.. خۆزگە نەیدەخواردەوە.. دانیشت منیش قسەم بۆ دەکرد تا لەهۆش خۆی چوو.. جارێك پێدەکەنیم و جارێکیش دەگریام.. نازانم تووشی چی هاتووم.. پێدەکەنیم و دەگریم و فرمێسك بەڕوومەتەکانمەوەیە..

ووردە ووردە ئیبلیس وەسوەسەی بۆ دروست دەکردم کە باوکم و دایکم پێم ئەزانن، ئەگەر خوشکەکەم بەو شێوەیە ببینن.. بیرم لەڕاکردن کردەوە.. بەهەرحاڵ ڕامکرد بۆلای هاوڕێکانم.. مژدەی ئەو کارەساتەم پێدان کە خۆم بەسەر خۆمدا هێنا.. هەموان پیرۆزباییان لێکردم..

ووتیان یەکێك پیاو نەبێت ناتوانێ کاری وا بکات، تۆ ئێستا سەرۆك و گەورەی ئێمەیت..

تۆ سەرۆکی ئەم گروپەیت.. مافی فەرمان دەرکردن و ڕەتکردنەوەت هەیە.. ئەو شەوە خەوتین بۆ نزیکی نیوەڕۆ لەرزم لێهات بەخۆمم دەوت، چیم کرد بەخۆم.. بەم دەستانەم چیم ئەنجامدا.. دوای دوو ڕۆژ باوکم سۆراخی دەکردم دوای ئەوەی دیارنەمابووم.. هاوڕێکانم نارد تا بزانن لەماڵمان چ باسە.. چونکە دەترسام لەخۆم و لەخوشکەکەم، دڵنیایان کردم کە هەموو شتێ ئارامەو هیچ ڕووی نەداوە.. چووم بۆ ماڵەوە و خۆم ئامادەکردبوو بۆ لێدان و قسە پێ وتن و سەرزەنشت کردن کە هیچ سودێکی نەبوو...

باوکم لێیدام، دایکیشم و خوشکەکەم لۆمەیان کردم، دوای چەند ڕۆژێك خوشکەکەم هات بۆلام و پرسیاری ئەو شتەی لێکردم کە خستبوومە چاکەیەوە.. حەزی لێدەکرد و داوای دەکرد، منیش ڕازی نەبووم.. بۆیە دەستی کرد بە پاڕانەوە.. وەك چۆن من لە هاوڕێکانم دەپاڕامەوە.. منیش

بەزەیم پیادا هاتەوەو پێمـدا.. ئـەم کـارە زۆر جـار دووبـارە دەبوویەوە.. حاڵەتی خوێندنی ووردەوردە خراپ بوو.. تا ئەو ڕادەیەی بەبێ هۆیـەکی ئاشـکرا وازی لەخوێنـدن هێنـا.. ئەوانیش ئارامیان گرت چونکە کچ دواهـەمین مـەنزڵگای هەر ماڵەوەیە..

ئـیتر ئومێـدیان بـەو برایـەم هـەبوو کـە لـەمن بچوکتربوو.. جارێکیان من حەبم پێ نەمابوو.

بۆیە خوشکەکەم ناچـار بـوو لەهاوڕێیـەکم داوا بکـات.. ئەویش نەیدابوویە بەمەرجێك نەبێت.. ئایا دەزانی مەرجی چی بوو (حسبی الله ونعم الوکیل) خواپەنامان بدات لێـی و لە شەیتان.

مەرجی ئەوەبوو کە زینا لەگەڵ خوشکەکەمدا بکات.. ئەویش ڕازی نەبوو.. کردبووی بە دەنگە دەنـگ لەگـەڵی.. ئـەو هاوڕێیانەشـم کـە لـەوێ ئامـادەبوون دەیانەویـست هێمنیان بکەنەوە، و بەمنیان دەوت: چی تێدایـە یـەکجار زیانی نیە.. لە خوشکەکەت بپرسە ئەگەر ڕازی بێت.. تۆ چ

زیانێکت پێ دەگات، و هیچ لەدەست نادەیت.. هەموویان دژی من بوون و لەگەڵ ئەودا بوون..

پێم ووت: تۆ یەکەم کەسیت: پێت دەوتم من لەگەڵتدام بۆ چارەسەرکردنی و ڕزگاربوونی خوشکەکەت، بەڵام ئەمڕۆ داوای ئەمە دەکەیت.. ئەمە هاوڕێیەتیەکەت بوو.

پڕ بەدەمی ووتی: چ هاوڕێیەتیەك و چ چارەسەرێك، شێخەگیان، لەبیریکە.. بوو بەدەمەقاڵەمان و دورکەوتمەوە لەوێ.. چەند ڕۆژێکم بەو شێوەیە بردە سەر.. من وخوشکەکەم ئارامان گرت، خوشکەکەم دەستپێشخەری کردو داوای دەکرد، منیش پێم نەبوو، لەوان زیاتریش کەسم شك نەدەبرد..

حاڵەتی خوشکەکەم خراپتر دەبوو، وای لێدەکردم بەلەتە حەبێکیش بێت، شەیتان وەسوەسەی خستە دڵمەوە کە لێی بپرسم، بۆیە منیش بەڕاشکاوانە پێم ووت: ئەو تۆی دەوێ یەکەم جار دەیەوێ بتبینێ، پاشان چیمان دەوێ بمانداتێ بەبێ بەرامبەر ئیتر جارێکی تر پێویستمان بەکەسی تر نابێ، خوشکەکەم یەکسەر ڕازیی بوو.. ئای

خوایەگیان.. ڕۆشتین، من و خوشکەکەم پلانماندانا و چوینە دەرەوە.. خوشکەکەم برد بۆلای هاوڕێکەم، و لەشوقەکەیدا دانیشتین..

هاوڕێکەم داوای لێکردم کە کەمێك بڕۆمە دەرەوە تا کاری خۆی تەواو دەکات.. منیش ڕۆشتم خوا نەفرەتم لێکات لە من و لە هاوڕێکەم و لەشەیتانەکانم و لەو حەبانەو لەوانەی بەکاری دەهێنن.. دوای سەعاتێك گەڕامەوە.. خوشکەکەمم بەنیوە پۆشتەیی بینی لەشوقەی هاوڕێکەمدا، من تازە پەنەکەم دابوو.. پێکەوە دانیشتین.. من و هاوڕێکەم و خوشکەکەم، خوشکی ڕاستەقینەم.. تا دوای عیشا لە دانیشتنێکی خواردنەوەو ڕابواردندا.. هاوار بۆ من لەپەروەردگارم.. هاوار بۆ من لەپەروەردگارم.. هاوار بۆ من لە ئاگرو..

من دۆزەخیم.. من دۆزەخیم.. خۆزگە بمردمایە.. خوایەگیان بمرێنە.. خوایەگیان بمرێنە.. من ئاژەڵم.. شایانی ژیان نیم بۆ ساتێکیش بێت.. من و خوشکەکەم گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بە خوشکەکەمم وت: ئەمە یەکەمین و دواهەمین

جارە.. ئەو هاورێ ڤیزەونـەم جـێ ژوان و ژمـارەی تایبـەتی خۆی دابوو بە خوشکەکەم، پێویست بە من ناکات.

مـن نـەمزانی.. ڕۆژان بەسەرچـوون و خوشـکەکەمم دەبینی دەڕواتە دەرەوە زیاد لە پێویست.. جارێ خۆی، جارێ لەگەڵ خوشـکە بـچوکەکەمدا، بەهـەر هۆیەکـەوەبێ بـۆ بازاڕو بۆ نەخۆشخانە تا ئەو ڕادەیەی ڕازی نەبوو جـارێکی تر لە پەیمانگا بخوێنێت.

باوکی داماویشم بەهەموو توانایەکیەوە لەڕێی چەندین کەسەوە تاوەکو سەرلەنوێ بیگەڕێنێتەوە بۆ خوێندنەکەی.. خێزانەکەمان سەرلەنوێ دڵشادبوونەوە بـە گەڕانـەوەی بـۆ خوێندنگاو گرنگی پێدان پێی..

جارێکیان من لای یەکێ لە هاورێکـانم بـووم ووتـی: بـا بچین بـۆلای یـەکێ لـەهاورێکانمان.. چـوین بـۆلای ..ئـای لەکارەسات.. خوشکەکەمم بینـی لـەلای، لەکۆشـیدابوو.. بەتاسەوە گریام.. خوشکەکەم هەستایەوە و ووتی: تۆ هەقت چی یە، ژیانی خۆمەو من سەربەستم.. هاورێکەم منی برد لەگەڵ خۆیداو ئەو ژەهرێکی یـامێ کـە مـرۆڤ ئـازیزترین

شتی لەبیردەچێ و لەبەرچاوی لێ دەکات بە ناشرینترین و قێزەونترین شت..

گەڕاینەوە بۆلای هاوڕێکەمان، منیش لەوێ بووم و، یاریان دەکرد لەگەڵ خوشکەکەمدا، منیش لەنێوانیاندا وەکو چوارپێ وابووم، بەڵکو خراپتریش، و نەفرەتیان لەژیان و چارەنوس دەکرد.

لەگەڵ کاتی عەسردا گەڕاینەوە بۆ ماڵ، من نەمدەزانی چی بکەم، داوێنپاکی ڕۆیشت و پارە ڕۆیشت و شەرەف ڕۆیشت و ئایندە ڕۆیشت و عەقڵ ڕۆیشت و بێگومان هەموو شتێك لەدەست چوو.. چەندین ڕۆژ کە بەخەبەر دەهاتم دەگریام کەسەرخۆشیش دەبووم پێدەکەنیم، ژیانێکی ئاژەڵی.. بەڵکو قێزەونترین ژیانی بێ بەهاو پیس و بێ نرخ... جارێك لە جارە شومەکان کە ژیانی من هەمووی شووم بوو.. لەبەرەبەیانی ڕۆژێکداو لەسەعات نۆی بەیانی پۆلیس پەیوەندی کرد بە باوکمەوە لەسەر کارەکەی و پێیان ووت: خێرا ئامادەبە.. ئەویش ئامادەبوو، بەڵام گورزێك بوو بۆسەر باوکم کە بەرگەی نەگرت و دوای

چەند ڕۆژێ وەفاتی کرد.. دایکیشم لەزمان کەوت.. ئایا دەزانن بۆچی؟ ئایا دەزانن؟

خوشکەکەم لەگەڵ کوڕێکدا لەناوچەیەکی حەوانەوەدا لەدەرەوەی شار بەسەرخۆشی تووشی ڕووداوێ بوون و هەردووکیان مردبوون.. ئای کە کارەساتە.. بەرد دێتە گۆو دەگری..

ئای کەکۆتاییەکی ناهەمواربوو.. خوشکی بەڕێزم خەتای تۆ نەبوو تۆ ئەو ڕێگایەت هەڵنەبژاردبوو.. وە ئاواتت هەرگیز بۆ نەدەخواست.. خوشکی داوێن پاکم.. بوویت بەسۆزانیی.. خوشکی بەشەرەفم بویت بە زیناکەر.. خوشکی ئیمانداری داوێن پاکم بووی بە بەرەڵا.. ئای خوایەگیان.. چیم کرد بەو خوشکەم.. ئەو ڕێگایە چی بوو کە پێی بردمە ئاگری دۆزەخ.. بەدەستم بردم بەرەو نەفرەت لێکردن.. من بردم بەرەو سەرنزمی .. پەروەردگارم، چی بکەم.. پەروەردگارم، داوات لێ دەکەم کە من ببەیتەوەو سزام بدەیت لە جیاتی ئەو، پەروەردگارم تۆ دەزانیت کە

ئەو بێتاوانە، من زوڵمم لەو کردو من ئەوم فەوتانـدو ئـەو نەیدەزانی..

ئەو دەیەویست من چاك بکـات، بـەڵام مـن ئـەوم بـەرەو خراپە برد، نەفرەتی خوا لە مادده هۆشبەرەکان.. ئەوانـەی بەکاری دەهێنن.. بـاوکم دوای چـەند ڕۆژێ وەفـاتی کـرد.. دایکیشم دوای ئەو ڕۆژێ زمـانی بەسـترا.. مـنیش هێـشتا بەچـارە ڕەشـی خۆمـەوە دەتلێمـەوە، و براکـانم لەکـەناری چاڵێکی تیاچوون و دەردی سـەریدان.. نـەفرەتی خـوا لـە مادده هۆشبەرەکان و ئەوانە بەکاریدەهێنن..

دوای ماوەیەك بـیرم کـردەوە کـە تۆبـە بکـەم، توانـای ئارامگرتنم نەبوو، ڕوخسەتم لە دایکم خواسـت کەسـەفەر بکەم بۆ هەندەران بە بیانوی گەشت بۆ ماوەیەك کە چـەند مانگێ دەخایەنێ، بەبیانوی لـەبیرکردنی ئـەم کارەسـاتە.. چووم بۆ نەخۆشخانەی (الأمل- هیـوا) دوای ئەوەی ژیـانی خۆم و خێزان و خوشکەکەمم تێکشکاند..

خوشکی بەڕێزم خوای گەورە ڕەحمەت پێ بکات.. پەروەردگار لێی خۆش ببە.. پەروەردگارا، لێی ببورە ئەو داماوەو من لەناوبەرە لەباتی ئەو..

سوربووم لەسەر چارەسەرکردن، کاتێ پرسیاری ماددەی هۆشبەریان لێ کردم.. سوربووم لەسەر ئەوەی کە لەدەرەوە فێربووم.. هەرچەندە هەمیشە لەبەرچاوم بوو، وە دوای چەند مانگێک چارەسەرکرام و ڕزگارم بوو لە ماددە هۆشبەرەکان..

بەڵام دوای چی، دوای ئەوەی هەموو سنوورەکانم بەزاند کە ژیانێکی ئارام و بەختیاری بۆ دابین کردبووین.. گەڕامەوە بۆلای کەس و کارم.. بە پیتاکی خەڵکی دەژیاین.. دایکم خانوەکەمانی فرۆشتبوو، خانوویەکی تری گرتبوو بە کرێ لە کۆشکێکی دیلۆکسەوە بۆ شوقەیەکی سێ ژووریی.. ئێمە هەشت سەر خێزان بووین.. دوای ئەو هەموو خۆشگوزەرانیە لەسەر حەسیر دەژیاین..

باسی خەڵکیش با بوەستێ، من بێکاربووم، براکانیشم کە لە من بچوکتر بوون نیوەیان وازیان لە خوێندن

هێنابوو، بەهۆی سەختی باری بژێویەوە.. کەسوکارم ئەگەر ناوی خوشکەکەم ببرایە نەفرەتیان لێ دەکردو قسەیان پێ دەوت و برینداریان دەکرد.. چونکە ئەو هۆکاربوو لەو هەموو نەهامەتیە.. دەیانخواست بچێتە دۆزەخەوە.. منیش دڵم پارچە پارچە دەبوو بۆی چونکە ئەو بێتاوان بوو... کەسوکاری مینش ئەوەیان نەدەزانی.

وە ناتوانم خەبەر بدەم لە هاوڕێ خراپەکانم، ئەوانەی ژیانی من و خوشکەکەمیان داڕوخاند.. چونکە ئەگەر هەواڵ بدەم.. ئەوە برینی کەس و کارەکەم زیاتر دەکات کەهێشتا سارێژ نەبووە بەهۆی ئەو کارەساتەوە کەبەسەر خوشکەکەم و باوکم و دایکم و داوێن پاکیمانداو شەرەفماندا هاتووە.. چونکە ئەو کاتە دەزانن من هۆکاربووم و برینەکەیان نوێ دەبێتەوە..

هاوڕێ خراپەکانم منیش تێوە دەگلێنن ئەگەر خەبەریان لێ بەم.. من دۆش داماوم.. هەمیشە دەگریم و کەسیش هەستم پێ ناکات.. من پێم وایە دەبوو بەبەرد ڕەجم بکرامایە، ئەمە بەنیسبەت منەوە هیچ شتێ نابێ بەکەفارەتی ئەو تاوانەی من.

تەماشاکەن برایانم بزانن مادده هۆشبەرەکان چی بەسەردا هێنام، بەڕاستی قیزەونترین شتە.. شومێکی نەگریسە.. چەندماڵی تێکدابێت و چەند مرۆڤی سەرەڕۆکردبێت و چەند خێزانی

هەڵوەشاندبێتەوە.. برایانم پێمەکەنن و سەرتان سوڕنەمێنێ و بڵێن پەروەردگار لۆمەی ناکەین.. برایانم پەند وەربگرن و ئەم بەسەرهاتەم باس بکەن بۆ ئەوانەی کە دەیانناسن.. بەڵکو بەهۆی بەسەرهاتی منەوە با تاکە کەسێکیش بێت ڕێنمایی بکرێت.. تا ببێتە کەفارەتی ئەو تاوانە مەزنەی من، کەوا گومان دەبەم کە پەروەردگارم لێم خۆش نابێت.

داواتان لێدەکەم دوعای خێر بۆ خوشکەکەم بکەن بە شەو و بە ڕۆژ بەڵکو خوای گەورە ڕەحمی پێبکات بەهۆی دوعاکانتانەوە.. چونکە دوعا لەمن وەرناگرێت، چونکە من وام بەسەرهێنا و تووشی ئەو هەموو نەهامەتیەم کرد.. پەروەردگار ڕەحم بە خوشکەکەم بکە، پەروەردگار ڕەحمی پێ بکەو لێی خۆشببەو بە خوا من پێویستم بە هەڵوێستی ئێوەیە لەم ناڕەحەتیەمدا، بەڵام من هیچم لە ئێوە ناوێت و سوپاسی ئەو برایەم دەکەم کە ئەم ناسۆریەی منی نووسی کە لەبەردەستاندایە و بەهاوڕێی ڕاستەقینەی خۆمی دەزانم و خوا پشتیوانی بێت.

وە سوپاسی ئەوە دەکەم کە بڵاوی دەکاتەوەو باسی دەکات.. ئەمە کورتەی بەسەرهاتی من بوو، ئەگەر بەدرێژی باسم بکردایە.. ئەوە بێزتان لەخۆتان دەهاتەوە، و چاوتان لەشەرماندا دادەخست.. بەڵکو ئەمەی کە ووتوومە بەس بێت و بەسوودبێت..

## یەك گورچیلە

سەعات دەوروبەری چواری بەیانی بوو.. هەموو شتەکانی دەوروبەری کش و مات و بێ جوولە بوون، تەنها گەلای درەختەکان نەبێت کە شنەی بەرەبەیان دەیجولاندنەوە، لقی درەختەکە نزیکی پەنجەرەکە بووبوویەوە خەریك بوو باوەشی پیادا دەکرد، هێمنی و ئارامی هەمووشوێنێکی گرتبوویەوە، لەپڕ ئاگادارکەرەوەکە زەنگی لێدا، تررررن..تررررن.. تررررن.. بەپرتاو خەدیجە ئەو دەنگە ناقۆڵایەی کپ کرد و لەناوجێگاکەی هاتە دەرەوە، بەلەش قورسی یەوە بەرەو دەست شۆرەکە ڕۆی.

خەریك بوو ڕادەهات لەگەڵ لەش قورسیەکەیدا، ئەو لەکۆتایی مانگی هەشتەمی سکەکەیدایە، سکی گەورەبووە، قاچی قورس بوو، بەساناترین شت ماندوو دەبوو، تا ئەو ڕادەیەی بەناڕەحەتیش هەناسەی دەدا، دەم و چاوی تێك چووبوو، ڕوخساری بەهۆی زۆریی گریانەوە تەڕ بووبوو، بەلام پێویستە لەم کاتەدا لەخەو هەستێت، تەنها سەعاتێکی ماوە بۆ بانگی بەیانی!!، خەدیجە نزیکترین

هاوڕێم بوو، نزیکەی سێ ساڵ بەسەر شووکردنیدا تێپـەڕی بوو، بێگومان کاتێ کە خۆی و مێردەکـەی زانیـان سـکی هەیە زۆر دڵشادبوون، بەڵام لەیەکێ لە سەردانەکانیدا بـۆ لای پزیــشکی پــسپۆڕ و دوای ئەنجامــدانی پــشکنینی پێویست، پزیشکە ئافرەتەکە هەواڵی پێدا کە ئەو کـچەی لە سکیدایە، تەنها خاوەنی یەك گورچیلەیە!! سـبحان الله پزیشکان لێرە لەڕۆژئاوا لەگەڵ ئـەوەدا کـە پێـشکەوتوون لەڕووی زانستەوە بەڵام هەسـتی مرۆڤایـەتیان تێـدا نیـە، ئـەوەتا خەدیجـە تووشـی شـۆك هـاتووە لـەو هەواڵـەی پزیشکەکە پێی ووت، بەوپەڕی خـوێن سـاردیەوە، ئێـستە ئەو هیچ چارەیەکی کتوپڕی لەلا نیـە، بـەڵام دوای مـنداڵ بوونەکە دەتـوانرێ چـەندین پـشکنین لەسـەر منداڵەکـە بکرێـت، تـاوەکو ڕادەی تەندروسـتی یـەك گورچـیلەکە بزانرێت، ئەگەر تەندروستی گورچیلەکە باش نـەبوو ئـەوە نەشـتەرگەری چـاندنی گورچـیلە وەکـو نەشـتەرگەری لۆزەتێنی لێهاتووە!! خەدیجە لەلای پزیشکەکە هاتە دەرەوەو ئاگای لەخۆی نەمابوو.. نەیدەزانی چۆن گەشتووەتە مـاڵی خۆیان!!

یەکەمین منداڵیەتی و یەك گورچیلەشی هەیە، ئەی چارە چی یە؟ تۆ بلێی پزیشکەکە لە پشکنینەکەیدا هەڵەی کردبێت؟ خەدیجە و مێردەکەی گەڕان بەدوای باشترین پزشك لەو بوارەدا، بەلام هەموو پزیشکەکان هەمان قسەیان کرد.. یەك گورچیلە!! وە لەگەڵ هەموو سەردانێکیدا بۆلای پزیشك هیواو ئومێدیان کەمتر دەبوویەوە، لەکۆتاییدا تەسلیمی ئەمری واقیع بوون، وە کۆتاهەمین پزیشك پێی وتن کە خۆیان ماندوونەکەن و بارودۆخەکە هیچ ناگۆڕێت.

خەدیجە لەوساتەدا هەستی بەوە دەکرد کە هیچ لەدەسەلاتی ئەمدا نیە، تەنها ڕووکردنە خوای پەروەردگار نەبێت بەدوعاکردن، لەو ڕۆژەوە بڕیاریدا سێیەکی کۆتایی شەو زیندووبکاتەوەو هەستێت بۆ نوێژ و دوعاکردن بۆ کچەکەی کە هێشتا لە دایك نەبووە.

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:{وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ}البقرة١٨٦

واتە: (ئەی محەمەد ﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بەهانای ئەوانەوە دەچم کە تکاکارمن، دەبا ئەوانیش بەدەم منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بەمن بهێنن بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنە بەر.

﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدُيرٌ{١٧}]الأنعام

واتە:(دڵنیابە لەوەی) ئەگەر خوا دووچاری زیان و گرفتێکت بکات، ئەوە هەرگیز لابەری نیە جگە لەخۆی نەبێت، وەئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێکدا هەیە.

[وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلاَ رَآدَّ لِفَضْلِهِ يُصَيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ{١٠٧}] يونس..

واتە:(ئەی ئینسان) ئەگەر خوا تووشی زیان و گرفتێکت بکات، ئەوە کەس ناتوانێ لایبەرێ جگە لەخۆی نەبێت، وە ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت،

هەرکام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات، ئەو زاتە هەمیشە لێبوردەو میهرەبانە.

[وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ{٦٠}]غافر

واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆ من بهێنن ئەوە من وەڵامتان دەدەمەوە، بەڕاستتی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن و لووت بەرزیی دەکەن لە ئاستی پەرستنی مندا، لە ئایندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتیەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە هەروەها لەفەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، لە ئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى سماء الدنيا، حين يبقى ثلث الليل، فيقول: من يدعوني فأستجيب له، من يسألني فأعطيه، من يستغفرني فاغفر له﴾ رواه البخاري (١١٤٥)، مسلم (١٧٧٢).

واتە: خوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دنیا، کاتێ کە سێیەکی کۆتاهەمی شەو مابێت و دەفەرموێ: کێ داواکاری هەیە لە من با وەڵامی بدەمەوە،

کـــێ شـــتم لێ داوادەکـــات بـــا بیـــدەمێ، وە کـــێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات با لێی خۆش ببم.

خەدیجە دڵنیابوو کە پشت و پەنا تەنها پەروەردگارە، بۆیە بەیانیـــەك نـــەبوو کـــە ســـەعاتێك پـــێش بـــانگی بـــەیانی هەڵنەسێت یان زووتر، هەرچەندە بـــەهۆی کـــەم خـــەوتن و سکەکەشیەوە زۆر ماندوو بوو.

ڕۆژانـــە لـــە ســـێیەکی کۆتـــایی شـــەودا دەچـــووە ســـەر بەرماڵەکـــەی بـــۆ نوێـــژکردن و ســـوجدەبردن بەخـــشوعەوە (بەملکەچـــیەوە)وە دەپاڕایـــەوە لـــەخوای پـــەروەردگار کـــە کچەکەیی پێ ببەخشێت بە تەندروستیەکی باش و بـــەدوو گورچـــیلەوە! لەســـەر دووعـــاو پاڕانـــەوەکانی ســـووربوو، وە دەگریا بەڕادەیەك کە بەرماڵەکەی تەڕ دەکرد، ڕۆژێك نەبوو ماندوو بێتاقەت بێت، هەرچەندە جەستەشی ماندوو بـــوو، ڕکوع و سجود بۆ ئەو زۆر ناڕەحەت بوو، بەڵام کۆڵی نەدەدا و بێزاری دەرنەدەبڕی بـــا بۆیـــەك جـــاریش بێـــت، هـــەرکاتێ پزیـــشکەکە هـــەمان ئـــەنجامی پـــێ دەووت و لەهـــەموو ســـەردانەکاندا لەگـــەڵ هـــەموو پـــشکنینێکدا ئـــەم زیـــاتر

سووربوو لەسەر شەو هەستانەکەی لە سێیەکی کۆتایی شەودا.

مێردەکەی بەزەیی پیادا دەهاتەوە بەهۆی زۆر هەستانی و ترسی هەبوو منداڵ بوونەکە بەباشی نەکەوێتەوە، وە هەمیشە بیری ژنەکەیی دەخستەوە کە پەروەردگار هەندێ جار وەڵامدانەوەی دوعا دوادەخات، لەئەبوسەعیدەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ما من مسلم يدعو بدعوة ليس فيها إثم و قطيعة رحم إلاّ عطاه الله بها إحدى ثلاث: إما أن تعجل له دعوته، وإما أن يدخرها له في الآخرة، وإما أن يصرف عنه من السوء مثلها قالوا إذا نكثر قال الله أكثر﴾ الترمذي: ٣٦٠٤.

واتە: هەر موسوڵمانێ لەدوعاکانیدا داوا لەپەروەردگار بکات بەمەرجێ داواکاریەکەی بۆ گوناهکاریی یان بچڕانی سیلەی ڕەحم نەبێت بێگومان پەروەردگار یەکێ لەم سیانەی پێ دەبەخشێ: یان داواکاریەکەی پێش دەخات و بۆی ئەنجام دەدات، یان هەڵیدەگرێ بۆ قیامەت و لەوێ پاداشتی دەداتەوە، یان بەئەندازەی ئەوە لە زیان دووری

دەخاتەوە، ووتیان: ئەی ئەگــەر داواکاریــەکانمان زۆر بێــت، پێغەمـبەرﷺ فەرمووی: خوای گەورە زۆرتری لەلایە.

ئەویش بەبیری مێردەکەیی هێنایەوە کە چارە نیە تــەنها داواکردنی کۆمــەك نــەبێت لەپــەروەردگار، ئەگــەر داوای کۆمەك لەپەروەردگار نەکات ئەی داوای کۆمەك لــە کــێ بکات؟؟!!

لا تسألن بني آدم حاجة

وسل الذي أبوابه لا تحجب

الله يغضب إن تركت سؤاله

وبني آدم حين يسأل يغضب

واتە: داوای پێویستی لە بەنی ئادەم (مرۆڤ) مەکە

داوا لەو زاتە بکە کە دەرگاکانی داناخرێت

پەروەردگار توڕەدەبێت ئەگەر داوای کۆمەکی لێ نەکەی

وە بەنی ئادەم توڕە دەبێت گەر داوای کۆمەکی لێ بکەیت.

چــــۆن داوای کۆمــــەکی لێ ناکـــــات لەکاتێکــــدا پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی قودسـیدا لەسـەر زاری پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿یا عبـادي لـو أن أولكـم وآخـركم وإنسكم و جنّكم قاموا في صعيد واحد فسألوني، فأعطيت

كل إنسان مسألته، وما نقص ذلك مما عندي إلاّ كما ينقص المخيط إذا أدخل البحر﴾. رواه مسلم/٦٥٧٢.

واتە:﴿ ئەی بەندەکانم ئەگەر لەیەکەمین کەستانەوە تا دواهەمینتان بە مرۆڤ و پەریەوە، لەیەك زەوی پان و بەریندا کۆببنەوەو دوعاو داواکاریتان هەبێت، داواکاریی هەموو مرۆڤەکان ئەنجام دەدەم، ئەمەش هیچ لە ڕۆزی و نیعمەتی من کەم ناکاتەوە وەك چۆن دەرهێنانی پەتێك لەدەریایەکدا لە ئاوی دەریاکە کەم ناکاتەوە).

وە پێش کاتی منداڵ بوونەکە بە نزیکەی دووهەفتە خەدیجە هات بۆ سەردانم، کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات و نوێژمان کرد و پێش ئەوەی هەستین خەدیجە دەستی درێژ کرد و باڵی گرتم و هەواڵی دامێ کە هەست بە شتێکی سەیر دەکات، پرسیارم لی کرد ئایا هەست بە هیچ ئازارێ ئەکات، بە نەخێر وەڵامی دایەوە، بەڵام بۆ زیاتر دڵنیابوون بڕیارماندا پەیوەندی بە پزیشکەکەیەوە بکەین، داوای لێکردین لە نەخۆشخانە بیبینین، هەوڵماندا پەیوەندی بە مێردی خەدیجەوە بکەین بەڵام بێ سوود بوو، چونکە لە نوێژی هەینی بوو، پشتمان بە خوا بەست و چووین بۆ

نەخۆشخانە، سەرمان سوڕما کە هەواڵیان پێ داین لەکاتی خۆیدا ڕۆیشتووین، واتە کاتی منداڵ بوونەکەیەتی!! لەپاڵیدا دانیشتم و دەستم خستبوە سەر شانی و دڵخۆشیم دەدایەوە.. سوپاس بۆ خوا لەگەڵ ئەو ئازارانەشدا دەم بە دووعا بوو، بەڵام هەر لە خوا دەپاڕایەوە، منداڵێکی تەندروست باشی بداتێ و دوو گورچیلەی هەبێ!!.

فاتیمە لەدایك بوو.. لەش و لاری لاواز بوو، ووردیلە بوو، ڕوخساری بەلای شینیدا دەیڕوانی، وە لەپشتیدا چاڵێکی بچووك هەبوو لە شوێنی گورچیلەکەیدا، وەك ئەوەی جەستەی بچوکی ئەو بۆشاییەی مژیبێت کە شوێنی گورچیلەکەی بووە، من گریام و خەدیجەش گریا و بەدەم فرمێسکەوە پرسیاری لە تەندروستی کچەکەی دەکرد، بەچی وەڵام بدەمەوە؟!

چی بڵێم بە دایکێ شەوانێکی زۆر خەڵوەتی کێشاوەو پێڵوی چاوەکانی سوور هەڵگەڕاوە وە هێشتا ئازار ئەچێژێ!! "ماشەڵڵا جوانە" وویستم شتێکی تر بڵێم بەڵام قسەم بۆ نەدەهات!! سبحان الله... چەند خولەکێکی

نەخایاند ڕەنگە شین هەڵگەڕاوەکەی گۆڕا بۆ ڕەنگێکی گوڵین، سەرنجی ڕوخساری فاتیمەم دا، سبحان الله، ڕوخساری جوانە، بەڵام هەر کە تەماشام دەکرد ئەو ناڕەحەتیانەم دەهاتەوە یاد کە بەهۆی یەك گورچیلەکەوە تووشی دێت،، من هیچم نەوت و خەدیجەش بێدەنگ بوو.. هەریەکەمان بیرمان دەکردەوە، دەبێ ئایندەی ئەو منداڵە چی بێت کە یەك گورچیلەی هەیە؟! پزیشکەکانی منداڵەکە ئامادەبوون (پشکنینی پێویستیان ئەنجامداو پێیان ڕاگەیاندین کە بارودۆخی منداڵەکە سروشتی یە بەڵام پێویستە پشکنینی چڕوپڕی بۆ ئەنجام بدرێت تا بزانرێت ئایا گورچیلەکەی ساغە.. ئەوەش ئەنجام نادرێ تا دوو هەفتە بەسەر لەدایك بوونیدا تێنەپەڕێت..پێی ووتم (قەدەری خوایەو پەروەردگار چی بوێت دەیکات.. پێویست ناکات ئەو لاشە بچوکەی منداڵەکەم بخەمە ژێر پشکنینەوە)، بەڵام هۆکارەکانی گرتەبەر و بڕیاریدا ئەو پشکنینانەی بۆ بکات، ڕۆژی دیاریکراو هاتە پێشەوە، لەژووری چاوەڕوانیدا دانیشتین، چاوەڕوانی پزیشکە ئافرەتەکەمان دەکرد تا هەواڵی گورچیلەی منداڵەکەمان

پێ بدات، ئایا (فاتیمە) پێویستی بە گورچیلەیەکی نوێ هەیە، یان ئەو تاکە گورچیلەیەی هەڵدەستێ بە فەرمانی دوو گورچیلە؟؟!! پزیشکەکە هاتە دەرەوە و خەندە لە ڕووخساری ئەباری..

هات بەرەو ڕوومان و ووتی: نازانم چی بڵێم و نازانم چی ڕوویداوە!! بەڵام کچەکەت تەندروستی تەواوەو دوو گورچیلەشی هەیە!!

فەرموو تەماشاکە ئایا دووعاکردن بەکەم دەزانیت.. دووعا ئەو جۆرە سازشانە بەرهەم دێنێ!! ئای کاریگەریی دوعا و نزا چەندە جوانەو پەروەردگاریش چەندە بەبەزەییە بۆ بەندەکانی.

فاتیمە ئێستا تەمەنی پێنج ساڵانە.. خوای گەورە پاراستوویەتی و بۆتە سۆمای دیدەی دایك و باوکی.

## دەستە پاکەکان

(فابیان) کچێکی فەرەنسی نمایشکاری جلوبەرگ بوو، تەمەنی ٢٨ساڵ بوو، ساتی رێنومایی هاتبوو لە کاتێکدا نوقمی جیهانی ناوبانگی و فریودان و جەنجاڵی بووبوو، بە هێواشی پاشەکشەی کرد و هەموو ئەم جیهانەی وازلێهێنا و بە هەموو شتەکانیەوە رۆشت بۆ ئەفغانستان تا کار بکات لە تیمارکردنی موجاهیدە بریندارەکانی ئەفغان! لە نێو بارودۆخێکی نارەحەت و ژیانێکی سەختدا (فابیان) دەڵێ" ئەگەر فەزل و بەزەیی خوای گەورە نەبوایە بۆ سەر من ئەوە ژیانم دەفەوتا لە جیهانێکدا کە مرۆڤ نزم دەبێتەوە تا دەبێتە ئاژەڵێک، هەموو خەم و خەفەتی تێرکردنی حەزەکانیەتی و بە بێ بەها و بێ بنەما ".

پاشان باسی بەسەرهاتی خۆی دەکات و دەڵێت:" هەر لە منداڵیمەوە هەمیشە خەونم بەوەوە دەبینی کە ببمە پەرستارێکی خۆبەخش و کارم دەکرد بۆ هێورکردنەوەی ئازاری منداڵە نەخۆشەکان".

لە گەڵ رۆژگاردا گەورە بووم، بە جوانیم و شۆخ و شەنگیم جێ سەرەنجی هەمووان بووم، هەمووان هانیاندام

بە کەسوکارەکەشمەوە کەواز لە خەونی مندالّیم بهێنم و جوانی خۆم بقۆزمەوە بۆ کارێك کە قازانجێکی مادی زۆر و ناوابانگی هەبێت، هەموو ئەو شتانەی کە هەرزەکار دەتوانێ خەونی پێوە ببینێت و کاری لە رادەبەدەر ئەنجام دەدات بۆ گەیشتن پێی.

رێگەی بەردەمیشم ئاسان بوو، یان وابوو بەلای منەوە، بە خێرایی چیێژی ناوبانگم بۆ دەرکەوت و دیاری گرانبەهام بۆ دەهات کە خەونیشم بە بوونیانەوە نەدەبینی، بەلاّم نرخەکەی زۆر گران بوو، یەکەم جار پێویست بوو دابڕێم لە مرۆیی خۆم و مەرجی سەرکەوتنم ئەوە بوو کە دەستبەرداری هەستەوەریم و هەستم ببم و واز لەو ژیانە بهێنم کە پەروەردەکرابووم لە سەری، خەریك بوو زیرەکی خۆمم لە دەستدەدا، هەولّم نەدەدا لە هیچ شتێك تێ بگەم، بیجگە لە جولّەی لەشم و ئاوازی مۆسیقا نەبێت و هەروەها دەبووایە هەموو خواردنە خۆشەکانم لە خۆم یاساغ بکردایە و بژیمایە لەسەر ڤیتامینە کیمیایەکان و مادە بەهێزکەرەکان و چالاکبەخشەکان و پێش هەموو ئەمانە ئەبوایە هەستم بەرامبەر بە مرۆڤ لەدەست بدایە و رقم لە

کەس نەبێت و کەسم خۆش نەوێت و هیچ شتێ ڕەت نەکەمەوە.

خانەکانی جلوبەرگ منی وەك بتێکی جولاو لێکردبوو، ڕۆڵی بێهودەیی بوو بە دڵ و عەقڵەکان، فێر بووبوو کە چۆن دەبێت سارد و سەرسەخت و لە خۆبایی بم و لە ناخیشدا بەتاڵ بم، تەنها بریتی بووم لە لاشەیەکی ڕەق و تەق کە جلوبەرگ لەبەر دەکات، من بێ گیان بووم و دەجولامەوە و خەندەم دەکرد بەلام، بە بێ هەست، تەنها من خوازیاری ئەوە نەبووم بەڵکو چەندە نمایشکاری جلوبەرگ دابڕێ لە مرۆڤایەتی خۆی قەدەری ئەو لەم جیهانە ساردەدا زیاد دەکات...بەلام ئەگەر بە پێچەوانەی هەر ڕێنمایەکی نمایشی جلوبەرگ بێت ئەوە خۆی دووچاری هەموو جۆرە سزایەك دەکاتەوە کە بریتییە لە ئازاری دەروونی و جەستەیش.

لە جیهانی نمایشدا دەژیام بەو پەڕی خۆدەرخستن و پێشکەوتن و لە خۆبایی بوون و بەجێهێنانی حەزەکانی شەیتان، لە دەرخستنی شوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی ئافرەت بە بێ شەرم و حەیا، (فابیان) لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو وتی: هەستم بە جوانی جلوبەرگەکان نەدەکرد کە

بەسەر جەستەی بەتاڵمەوە بوو، تەنها پڕ بوو لە ئارەزووی دڵڕەقی لە کاتێکیشدا هەستم دەکرد بە سووك تەماشام دەکەن و رقیان لە خۆمە و تەنها رێز لە پۆشاکەکەی بەرم دەگرن.

کاتێ باس لە گۆڕانی کتوپڕی خۆی دەکات دەڵێت: ئەوە لە کاتی گەشتی ئێمەدا بوو بۆ (بەیروت)ی وێران کاتێ کە بینیم چۆن خەڵکی ئۆتێل و خانوو بنیات دەنێن لە ژێر زەبری تانکەکاندا، بە چاوی خۆم نەخۆشخانەی منداڵانم بینی لە بەیروت، بە تەنها نەبووم، بەڵکو لە گەڵ هاوڕێکانمدا بووم، کە وەك بتی مرۆڤ وابوون، تەنها بە لاموبالاتەوە وەك نەریتی خۆیان تەماشایان دەکرد، نەمتوانی لەوە زیاتر لە گەڵیان بەردەوام بم، لەو ساتەدا هەموو ناوبانگ و ژیانی درۆینە کە تێیدا دەژیام لەبیرم کرد و بەرەو لاشەی منداڵەکان رۆشتم تا کامەیان گیانی تێدا ماوە رزگاری بکەم.

نەگەڕامەوە بۆ لای هاورێکانم لە ئۆتێل، بەڵکو گەشتی من بەرەو مرۆڤایەتی دەستی پێکرد، تاگەیشتمە رێگای رووناکی کە ئیسلامە، (بەیروت)م بەجێهێشت و رۆشتم بەرەو پاکستان، لەوێ لە سنووری ئەفغانستان

ژیانی راستەقینەی خۆمم دەست پێکرد ، فێربووم کە دەبێت چۆن مرۆڤێك بم، لەوێ بۆ ماوەی هەشت مانگ مامەوە و هەڵدەستام بە یارمەتیدان و چاودێری ئەو خێزانانەی بە هۆی کارەساتی جەنگەوە گرفتارن... حەزم لە ژیانیان دەکرد ، و ئەوانیش باش بوون لە گەڵمدا.

قەناعەتی من بە ئیسلام وەك ئاین و دەستووری ژیان زیاتری کرد ، لە میانی ژیانم لە گەڵیدا و ژیانم لە گەڵ خێزانە ئەفغانی و پاکستانیەکان و شێوازی پابەند بوونیان لە ژیانی رۆژانەیاندا ، پاشان دەستم کرد بە فێربوونی زمانی عەرەبی کە زمانی قورئانە ، لەو بوارەشدا پێشکەوتنێکی باشم بە خۆمەوە بینی ، دوای ئەوە کە من ژیانم وەك نمایشکارێکی جلوبەرگ بەسەر دەبرد ژیای من گۆڕا و بە پێی بنەما و رۆحانیەتی ئیسلام دەژیام.

(فابیان) باسی هەڵوێستی هەڵسوڕێنەرانی ئەزیای جیهانی دەکات دوای هیدایەت دانی ... جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کەوتبووە ژێر پەستانێکی چڕوپڕی دنیاوە ، پێشنیاریان بۆ کردبوو کە موچەی مانگانەکەی بۆ دەکەن بە سێ ئەوەندە ، بەڵام رازی نەبوو.

پاشان تەنها ئەوەندەیان توانی کە دیاری گرانبەهای پێشکەش بکەن، بەڵکو بگەڕێتەوە و واز لە ئیسلام بهێنێت، دەڵێت: پاشان هانیاندام بگەڕێمەوە، پەنایان بردە بەر ناشرینکردنی وێنەم لەبەردەم خێزانە ئەفغانیەکاندا، هەڵدەستان بە بلاوکردنەوەی وێنەکان لەسەر ئەو گۆڤارانەی کە پێشر وێنەی منیان بلاودەکردەوە، هەڵیان دەواسی بە رێگەوبانەکاندا وەك ئەوەی تۆڵە لە تەوبەکردنەکەم بسەننەوە، بەوەش دەیانویست ناکۆکی بخەنە نێوان من و هاوڕێ و هاودەمە نوێیەکانم، بەلام سوپاس بۆ خوا گومانەکانیان پوچەڵ بوونەوە.

(فابیان) تەماشای دەستی دەکات و دەڵێت: پێشبینیم نەدەکرد کە ئەم دەستە ناسکانەم کە ماوەیەکی درێژم بەسەربرد تا نەرم و شل بن، ئێستا ئاوا ئیشی قورسیان پێ بکەم، بەلام ئەم کارە قورسانە زیاتر دەستەکانم پاك دەکەنەوە، پشت بە خوا پادشتی باشی لای خوای گەورە دەستگیر دەبێت.

العائدون الى الله – المجموعة الثالثة – محمد بن عزيز

## پێتان ئاسانە

(زەهیە) کچێکی شۆخ و شەنگ و جوان بوو، بە تایبەتی قژەکەی بەسەرشانیدا شۆڕ بووبووەوە، پێی وابوو دەبێ کە لەزەت لە هەموو شتەکانی ژیان وەربگرێت، کاتێ رۆژێکیان بانگهێشت کرا بۆ ئاهەنگی یەکێك لە هاورێکانی، قسەومشتومڕێکی زۆر کەوتە نێوان ئامادەبوانەوە و قسەوباسەکان لە وشکی و ساردیەوە گۆڕان بۆ گەرمی و بورکانی، باس وخواسەکە سەبارەت بە بالاپۆشی بوو.

ئەو باسی (سەنا)ی جوان و سەرنج راکێشی دەکرد کە بەوپەڕی دڵنیایی دڵیەوە و دڵئارامیەوە گوزارشتی دەکرد لەو رۆژەوە کە بالای پۆشی بوو.. رۆشت بۆ زیاتر لەوەش.. جەختی دەکردەوە کە بالاپۆشی هەنگاوی یەکەمی گەشتە درێژەکەیەتی بەرەو رێگای هەق و رووناکی، چونکە پێویستە دڵی رووناك بکاتەوە بە لەبەرکردنی ئایەتەکانی قورئان و بینایی رووناك بکاتەوە بە رامان لە مانای ئەو ئایەتە مەزنانە و پێویستە فیقه و سیرەش بخوێنێتەوە... پاشان سەنا بڕیاریدا کە گوزارشتەکان زیاترن لە کاتەکان.

ئاوێتە بوونی ئامادەبووان لە گەڵ قسەکانی (سەنا)دا جیاواز بوون لە نێو پشتگیریکردن و نەیار و سەرسام بووندا، تەنها هاوڕێکەی ئێمە نەبێت کە خەریکی لۆمە و گاڵتە و سەرزەنشت بوو، بە تایبەتی ساتی هەوڵدانی یەکێکیان بۆ ئالآندنی سەرپۆش لە ملی (زەهیە).. ئەویش بۆ دەرخستنی جوانیەکەی ئەگەر سەرپۆش بەسەر بێت... بەڵام (زەهیە) زۆر تووڕە بوو، بە بێزاری و تووڕەییەوە وتی: تکا ئەکەم، ئەوە لابە لە ملمدا، پاشان دەستی هێنا بە ملی و قژیدا و دەلەرزی، قسەی وای دەکرد کە هەمووانی سەرسام کردبوو، پاشان هێرشی کردە سەر ئەم شەریعەتە پیرۆزە، کە ملی ئافرەتی کۆت کردووە بە پەتی لەسێدارەدان.

یەکێ لە ئامادەبووان وەڵامی زەهیەی دایەوە، بەڵام زەهیە هەر نکولی کرد و بەرپەرچی بەڵگە شەرعیەکانی دەدایەوە، بۆیە هیچی شك نەدەبرد پەنای بۆ بەرێت بێجگە لە فەرهەنگی لۆمە و قسەوتن نەبێت، بەڵام سەنا هەستی کرد کە زەهیە هەر چی لە دڵیدا بوو لە رق و کینە هەڵی رشت بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان، بۆیە ترسا بە هۆی خراپەکەیەوە خوای گەورە هەموان بە هیلاکەتا

بەرێت... بۆیە داوای لە هەمووان کرد، داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن و پاشان بێدەنگ بن، چونکە بارودۆخەکە بارودۆخی وتوویژ و پەیڤین و قەناعەت پێکردن نیە، بۆیە کۆمەڵی ناو ئاهەنگەکە لە خراپترین بارودۆخدا جیابوونەوە و هەر یەکەیان گەرشانەوە بۆ شوێنی حەوانەوەی خۆی و ئەو ساتی هەڵچوون و موناقەشەیە لە ئەندێشە و مێشکیاندا بوو.

دوای ئەو ئاهەنگە ناخۆشە، زەهیە هەستی کرد کە شتێکی نادیار لە دڵیدایە و بێتاقەتی کردووە، هەوڵی دەدا رابکات لە خودی خۆی، بەڵام بێتاقەتیەکەی بوو بە سەرئێشەیەکی سەخت و ئازاراوی بەردەوام، لەسەرەتادا حەبی هێمنکەرەوەی بەکارهێنا، بەڵام سوودی نەبوو... خۆبەزلزانیەکەی رێگای نەدەدا ئازارەکەی ئاشکرا بکات لەبەردەم خێزانەکەیاندا و بە تایبەتی باوەژنی کە نارەحەتیەکانی زەهیەی بەوە نیشان دەدا کە عەیار و بەنازە، ئەو ئافرەتە بڕوای بە زەهیە نەدەکرد تەنها ئەو کاتە نەبێت کە بینی سەری کێشا بە زەوی ژوورەکەدا، بۆیە بە پەلە رایکرد و هەواڵیدا بە باوکی، ئەویش بردی بۆ نەخۆشخانە.

لـەوێ پزیـشکەکە داوای چـەند پـشکنینێکی کـرد، گومانەکان زۆریان بۆ پزیشکەکان هێنـا و خەویـشی لـە چاوی باوکی تاڵ کردبـوو، پاشـان پزیـشکەکە داوای کـرد وێنـەی مێـشکی بگیرێـت، وێنەکـە گومانەکـەی کـرد بەراسـتەقینە، پزیـشکەکە کاریگـەری خـۆی شـاردەوە و باوکی زەهیەی دڵنیا کردەوە و سوپاسی خوای کرد کە پێش وەخت توانیان دەرك بە نەخۆشیەکە بکەن و باوکی جێگای بە خۆی نەدەگرت کاتێ کە گوێی لـە قـسەی پزیـشکەکە بوو.. سەرەتای شێرپەنجەی مێشك.. پـشت بـەخوا ئەگـەری چارەسـەرکردنی هەیـە.. پێویـستە سـبەینێ بەیانیەکـەی کچەکەت بهێنیتەوە بـۆ دەسـتپێکردنی چارەسـەرەکەی و پزیشکەکە دەرمانەکانی دا بە زەهیە و رێنماییـەکانی بـۆ خوێندنەوە و باسی ئاسەوارە چاوەڕوانکراوەکانی بـۆ کـرد... زەهیە دەتوانێ چاوەڕوانی هەموو شتێك بکـات تـەنها قـژ رووتانەوە نەبێت !!

پەرەستارەکە دەرمانێکی بە (زەهیە)دا بۆ بەرگرتن لـە رشانەوەکەی، کە لە کـاتی چارەسـەری کیمیایـدا تووشـی دەبێت، بۆ رۆژی دوایی، دەرزیەکی ئەسـتووری لێـدرا کـە بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەری کیمیایی، بە درێژایی بیست

وچوار سەعات، بیست و چوار سەعاتی یەکەم تێپەڕی بەسەر زەهیەدا بە ناڕەحەتی، هەر لەسەرەتای ساتەکانی ئازاری یەکەمەوە زەهیە هەموو خۆشیەکانی ژیانی بیرچوویەوە، ئەگەر یەکێ لێی بپرسیایە چۆنیت وەك باوکی لێی دەپرسی(کچی خۆم چۆنیت) لە وەڵامدا دەیوت: ( زۆر خراپم، مردن زۆر لەم ژیانە باشترە) باوکی زەهیەش خەریك بوو سەری دەتەقی و فرمێسك بە چاویدا دەهاتە خوارەوە، ئاواتی دەخواست کە رۆحی خۆی ببەخشێت.. بەڵام هەی هو ئەوەی تووشی زەهیە بووبوو خەڵکانی سەر زەوی ناتوانن ئاراستەکە بگۆڕن و باشی بکەن.

هەستی باوەژنەکەشی لە نێوان نکولی و بەزەیی هاتنەوەدا بوو، بۆ رۆژی سێیەم دوای ئەوەی چارەسەرەکانی بۆ بەکارهێنرا، بۆماوەی سەعاتێك زەهیە بە سەختی دەرشایەوە و گەدەی تووشی ئازارێکی سەخت بوو.. ورەی بەرەو داڕوخان دەچوو.. کە بە تەواوی کاری کردە سەر باوەژنەکەی.. کە رایکرد بۆ لای پزیشکەکە کە فریایان بکەوێت... پزیشکەکەش هات تا ترس و تۆقینی زەهیە هێور بکاتەوە و پێی بڵێت ئەم نیشانانە کاتین و پشت بەخوا بە نەمانی نەخۆشیەکە نامێنن.

نارەحەتی و مەینەتیەکانی زەهیە بەردەوام بوون... رۆژانێك تێپەڕین کە زۆر تاڵ بوون لە ژێر کاریگەریی چاوەڕوانی چارەسەرەکەدا، ئەوە باسی ئەو کاتە مەکە کە چارەسەرکەی بۆ دەکرا و بۆی بەکاردەهێنرا... خەریك بوو نەیدەهێشت چارەسەری بۆ بکەن، کە بەراستی زۆر سەختتر بوو لە خودی نەخۆشیەکە، ئەگەر هێورکردنەوە نەبوایە، لە لایەن کەس وکاری و تیمە پزیشکیەکانی دەوروبەری.

چەند هەفتەیەکی نەخایاند چواردەوری چاوی رەش دەبوویەوە، دەیویست رابکات لەو راستیە، بۆیە میکیاجی دەورووبەری چاوی دەکرد، تەسکترین پۆشاکی خۆی دەپۆشی، کەچی دەڵپ بوو لەبەریدا... لەبەردەم ئاوێنەدا دەوەستا و دەستی دەبرد بۆ پرچی، کەچی بەدەستیەوە دەکەوتە خوارەوە، زەهیە دەستی کرد بە گریان، چونکە ناتوانێ پێشوازی لە سەنا بکات کە سوور بوو لەسەر ئەوەی سەردانی بکات... بۆیە سەردانەکەی دواخست، بەڵکو کاتێك سەردانی بکات کە ئەو چارەسەرەی بۆیان داناوە بەرهەمێکی هەبێت، کاتێ پزیشکەکان بەوە وەسفی دەکەن کە کاریگەرن، هەر کاتێك هەستی بە ئازار

بکردایە لە سەریدا هاواری دەکرد و سەری خۆی دەگرت و قژی هەڵدەوری.

باوەژنی زەهیە وتی بە سەنا: لەراستیدا حاڵەتی زەهیە بە خێرایی بەرەو خراپی دەڕوات، خۆزگە سەردانیت بکردایە، بەڵکو دڵخۆش ببێت بە بوونی تۆ بە تەنیشتیەوە.

سەنا لە خۆشیدا خەریك بوو دەفڕی، جوانترین دیاری و شیرینی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ زەهیە، کاتێك چوو بۆ لای زۆر بە نارەحەت ناسیەوە و تەوقەی لەگەڵدا کرد فرمێسکەکانی شاردەوە و دانی بەخۆیدا گرت... هەوڵیدا قسە لەگەڵ رۆحیدا بکا و وتی: لەوانەیە نەخۆشی، کەفارەتی گوناهەکان و بەرزکردنەوەی پلە بێت، پیرۆزت بێت تۆ کاتی درێژ بەسەر دەبەیت لە تەسبیحات و زیکر و ئیستغفاردا... زەهیە تەماشایەکی کرد و ویستی رووخساری بشارێتەوە لەبەردرەمیدا و لەبەردەم ئەو هەموو خواردنەی کە دانرابوو لەبەردەمیدا.

سەنا وردبوویەوە لەسەرپۆشەکەی زەهیە، کەسەری خۆی پێ داپۆشی بوو، بینی پیس و چڵکنە، کتومت وەك ئەو وەسفەی یەکەم جار زەهیە دەیکرد بۆ سەرپۆش!! مانا و پەندەکان لە عەقڵ و هۆشی سەنادا زۆربوون، دەیانـدا لە دەرگای سەری... گوێی دەگرت و دڵیشی وەڵامی دایەوە و ئەم ئایەتەی هاتەوە یاد (وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِنْدَ اللهِ عَظِيمٌ) واتە (ئێوە بە ئاسان تەماشای دەکەن بەڵام لای خوای گەورە مەزنە).

(أم حسان الحلو - موقع إسلام اليوم )

## نازانم گوێڕایەڵی کێ بم

کـچە بـچوکەکە لــە قوتابخانــە گەڕایــەوە، دوای ئــەوەی گەشتەوە ماڵەوە دایکی هەستی کرد کە بێتاقەتــە، بۆیــە داوای لە کچەکەی کرد کە بۆچی بێتاقەتە.

کچەکەش وتی:

- دایە گیان مامۆستاکەم هەڕەشەی دەرکردنی لێکردم لە قوتابخانە بە هۆی ئەو جلە درێژانەوە لەبەرمدایە!!

+ بەڵام ئەوە ئەو پۆشاکەیە کە خوای گەورە داوای دەکات، کچی خۆم

- بەڵێ دایە گیان بەڵام مامۆستاکەمان ئەوەی ناوێت.

+ باشە کچی خۆم مامۆستاکە ئەوەی ناوێت و خوای گەورە ئەوەی دەوێت، ئــەی تــۆ گوێڕایــەڵی کــێ دەکــەیت؟ ئایــا گوێڕایەڵی ئــەو خوایــە دەکــەیت کــە تــۆی بــەدیهێناوە و بەباشــترین شــێوە دروســتی کردوویــت و ڕۆزی ڕژانــدووە بەســەرتدا؟ یــان گوێڕایــەڵی دروســتکراوێ دەکــەیت کــە ناتوانێ سوود یان زیان بە خۆی بگەیێنێت.

کچەکەش وتی:

- بەڵکو گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکەم.

دایکی وتی:

+ دەستت خۆش کچەکەم راستت پێکا.

بـۆ رۆژی دوایـی کـچەکە بـە پۆشـاکە درێژەکەیـەوە رۆشتەوە بۆ قوتابخانە... کاتێ مامۆستاکەی بینـی زۆر بـە توندی سەرزەنشتی کرد و کچە بەسـتەزمانە بـچوکەکەش نـەیتوانی بەرگـەی ئـەو سەرزەنـشتە و تەماشـاکردنەی هاورێکانی بگرێت، بۆیە دەستی کرد بەگریان، پاشان ئـەو کچە بچووکە وتـانێکی ئاراسـتەکرد کـە لـە مانـادا زۆر گەورە بوون و وتەکان کەم بـوون.. ووتـی: بـە خـوا نـازانم گوێڕایەڵی کێ بکەم؟ تۆ یان ئەو..

مامۆستاکەش پرسی:

- ئەوە کییە؟

+ خوای گەورە، ئایا گوێڕایەڵی تۆ بکـەم و چـیت دەوێـت لەبـەری بکـەم و سەرپێـچی خـوای گـەورە بکـەم، یـان گوێڕایـەڵی ئـەو بکـەم و سەرپێـچی تـۆ بکـەم... مـن گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکەم و چی دەبێت با ببێت.

ئای کە چەندە وتانێکی جوان بوو.. لـەو زارە بـچکۆلەوە هاتەدەر و وتانێك لایەنگریی تـەواوی خـۆیی نیـشاندا بـۆ خوای گەورە.

ئـەو منداڵـە بـچوکە جـەختی لەسـەر پابەنـدبوون و گوێڕایەڵی دەکرد بۆ فەرمانـەکانی خـوای گـەورە و تـاکو تەنیای بە دەسەڵات.

ئایا مامۆستاکە لە ئاستیدا بێدەنگ بوو؟

مامۆستاکە داوایکـرد کـە دایکـی قوتابیەکـە بـانگ بکرێت... ئەبێت چی بووێت لە دایکی... و دایکی هات.

مامۆستاکە وتی بە دایکی: بە راستی کچەکەت مەزنترین ئامۆژگاری منی کرد کە تا ئێستا بیستبێتم لە ژیانمدا.

بەڵێ مامۆستاکە پەندی لەو قوتابیە بچووکە وەرگرت و ئـەو مامۆستایە پەروەردەی خوێندوە و زانستی وەرگرتووە، زانـستەکەی رێگای لێنەگرت پەنـد و ئامۆژگـاری لـە منـداڵێکی بـچووکەوە وەربگرێت کە لە تەمەنی کچێکە لە کچەکانی خۆی، سـڵاو لـەو مامۆستایە.

سڵاو لەو کچە بچکۆلەیە کە پەروەردەی ئیسلامی وەرگرتبـوو، و پابەند بوو پێوەی و سڵاو لەو دایکەی کـە خۆشەویـستی خـوا و پێغەمبەرەکەی چاندووە لە دڵی کـچەکەیدا... ئـەو دایکـەی کـە کچەکەی فێری خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە.

ئەی دایکانی موسڵمان: منداڵەکانتان وەك هـەویر وان و لـە نێو دەستی ئێوەدان و دەتوانن هەموو شتێ دروست بکەن لێیـان و دەی بەو شێوەیە بیانسازێنن کە رەزامەندی خـوا و پێغەمبەرکـەی تێدایە، فێری نوێژیان بکەن، فێـری گوێڕایـەڵی خـوای گـەورەیان

بکەن، فێری جێگیربوونیان بکەن لەسەر هەق، فێری هەموو ئەمانەیان بکەن پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی هەرزەکاری... ئەگەر بە منداڵی پەروەردە نەکرێن ئەوە کاتێ گەورە دەبن ئێوە زۆر پەشیمان دەبنەوە.

ئەم کچە لەسەردەمی هاوەڵاندا یان شوێنکەوتواندا نەژیاوە، بەڵکو لەم سەردەمەدا ژیاوە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین نموونەی ئەو کچە بێنینەدی، کچێکی خواناس و بوێر لەسەر دەرخستنی هەق کە گوێ بە لۆمەی کەس نەدات لەبەر خوای گەورە.. ئەی خوشکی ئیماندار ئەوەتا کچەکەت لەبەردەستی تۆدایە دەی بە ئاوی تەقوا و ئیصلاح تینوێتی بشکێنە.

دەی ژینگەکەی بسازێنە و مشەخۆر و مێرووی زیانبەخشی لێدوورخەرەوە.. ئەوەتا رۆژانێك لەبەردەستایە... تەماشاکە بزانە چی دەکەیت بەو راسپاردەیەی کە پەروەردگاری ئاسمان و زەوی سپاردوویەتی بە تۆ!!! پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت (من ارضى الناس بسخط الله وكله الله الى الناس ومن اسخط الناس برضا الله كفاه الله مؤنة الناس) صحيح جامع الصغير/ج(٥) حديث رقم(٥٨٨٦)

مواقف ايجابية - نجيب عامر/ج(٢٢٧)-٢٨

چیرۆکەکە وەرگیراوە لە (مواقف ذات عبر- العمر الاشقر)

## چیرۆکێکی خۆشەویستی مرۆڤ دێنێتە گریان

هاوڕێکەمان بڕیاریدا ژن بهێنێ و داوای لە کەس وکاری کرد بەدوای ئافرەتێکی گونجاوی خاوەن رەوشت و ئاییندا بگەڕێن... وەك داب ونەریتی باو، ئافرەتێکی خزمیان دەست نیشانکرد کە دەگونجێت بۆی، ئەمانیش چوونە داوای.

کەس وکاری کچەکەش رەزامەندیان نواند، چونکە هاوڕێکەمان هەموو نیشانەیەکی پیاوەتی تێدا بوو کە هەموو خێزانێك ئاواتە خوازی بوون... کاروبار بە رێکوپێکی بەڕێوەچوو و خوای گەورەش شادیی کرد بە نسیبیان لە زەماوەندێکی جوان و خاکیی، کەسوکار کۆبوونەوە بۆ پیرۆزبایی.

ورده ورده دوای زەواج و تێپەڕبوونی رۆژگار خەڵکانی دەورووبەر هەستیان دەکرد کە هاوڕێکەمان زۆر هۆگری ژنەکەیەتی لەبەرامبەریشدا کەسوکاری ژنەکە سەرسام بوون کە هەمیشە ناوی مێردەکەی بەسەر زاریەوەیەتی، بەڵێ ئەوان بڕوایان بە خۆشەویستی هەبوو بەڵام ئەوەی بە خەیاڵیاندا نەدەهات ئەوە بوو کە بڕوایان نەدەکرد بەوشێوەیە و تا ئەو رادەیە هۆگری یەکتر بن.

دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر هاوسەرگیریاندا لە لایەن کەس وکاریانەوە پەستانیان خرایە سەر تا منداڵیان ببێت، چونکە ئەوانەی کە لەگەڵ ئەماندا هاوسەرگیریان ئەنجامدابوو منداڵێك یان دووانیان هەبوو، بەڵام ئەمان هەروەك خۆیان وان، ژنەکە زۆری کرد لە مێردەکەی کە خۆیان نیشانی پزیشك بدەن بەڵکو ئەمە خوایە کارەکە ئاسان بێت و بە چارەسەر یان ڕێنماییەکی پزیشکی کۆتایی بێت.

ئەوەی بە خەیاڵدا نەدەهات ڕوویدا بۆیان دەرکەوت ژنەکە نەزۆکە، دوای سەرکۆنەی کەس وکاری هاوڕێکەمان و تانەوتەشەر، ئەوە بوو کە دایکی بەڕاشکاوی داوای لێکرد ژنی دووەم بهێنێت و ئەم تەڵاق بدات، یان لای خۆی بیهێڵێتەوە.. بۆیە هاوڕێکەمان کەس وکارەکەی کۆکردەوە و بە شێوازێکی باوەڕبەخۆوە وتی: ئێوە وا گومان دەبەن کە ژنەکەم نەزۆکە؟! بێگومان نەزۆکی ڕاستەقینە پەیوەندی بە منداڵبوونەوە نیە، من دەبینم کە لە هەستدا و لە ڕاستگۆیدا خۆشەویستیەکی پاکی هەیە، لە لایەن منەوە سوپاس بۆخوا ژنەکەم لە ڕۆژێکدا بۆ من سەد منداڵ دێنێت و من ڕازیم بەو و ئەویش ڕازیە بەمن، بۆیە

داواکارم جارێکی تر باسی بابەتی لەوجۆرە سوکەم بۆ مەکەن.

ئەو نەزۆکیەی کە وا گومانیان دەبرد کە دەبێتە هۆی جیابونەوەیان.. بووە هۆی ئەوەی ژنەکەی بۆی دەرکەوت کە چەندە مێردەکەی خۆشی دەوێت و قوربانی دەدات، دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە نۆ ساڵ ژن و مێردەکە خۆشترین ژیانیان بەسەربرد ، ژیانێکی رۆمانسی، ورد ورده ژنەکە رووبەرووی نەخۆشی سەیر دەبوویەوە، کە ناچار بوون پشکنینی بۆ بکەن لە یەکێ لە نەخۆشخانەکان، رۆشتن بۆ نەخۆشخانەی مەلیك فەیصەڵی تایبەتی، بۆیە لەوکاتەدا مێردەکەی کەوتە دڵەراوکێ، چونکە ئەو کەسانەی رەوانەی ئەو نەخۆشخانەیە دەکران نەخۆشی مەترسیدارن.

دوای دەستنیشانکردنی حاڵەتەکە و ئەنجامدانی شیکاری پێویست، پزیشکەکان بە راشکاوانە بە مێردەکەیان ووت کە ژنەکەی تووشی نەخۆشیەکی دەگمەن بووە کە ژمارەی تووشبووان بەو نەخۆشیە لە خۆرهەڵاتی ناوەراست لە پەنجەی دەست تێپەڕ ناکات و ئەوپەڕی زیاتر لە پێنج ساڵی تر ناژی، هەرچەندە تەمەنیش بەدەست خوای گەورەیە.

بەڵام ئەو شتەی ئازار و حەسەرت زیاتر دەکات، ئەوە بوو کە ساڵ بە ساڵ حاڵەتی خراپتر دەبوو، بۆیە باشتر وابوو لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە بۆ وەرگرتنی چاودێری پزیشکی پێویست و تا خوای گەورە راسپاردەکەی دەباتەوە، مێردەکەی رازی نەبوو بە داواکاری پزیشکەکان و رازی نەبوو بمێنێتەوە لە نەخۆشخانە و بۆیە سوور بوو لەسەر ئەوەی هەموو پێداویستیەکانی پزیشکی دابین بکات بۆ ژنەکەی لە شوقەکەیدا و رەخساندنی کەش و هەوایەکی گونجاو تا بە تەواوی چاودێری ژنەکەی بکرێت... بۆیە بایی نزیکەی(٢٦٠٠٠٠) ریاڵ پێداویستی پزیشکی بۆ کڕی، شوقەکەی بۆ ئامادەکرد تا ژنەکەی بهێنێتەدەر لە نەخۆشخانە، زۆربەی ئەو پارەیەشی قەرزکردبوو، هاوکات لە گەڵ راکێشانی سولفە لە بانقدا.

پەرستارێکی گرتبوو بۆ ژنەکەی تا هەستێ بە پێداویستیەکانی و خۆیشی داوای لە فەرمانگەکەی کرد مۆڵەتی بێ موچەی پێ ببەخشن، بەڵام بەڕێوەبەرەکەی رازی نەبوو، زانیبووی کە چەندە قەرزارە، چونکە پێویستیەکی زۆری بە تەنها ریاڵێکیش هەیە، بۆیە لە کاتی دەوامەکەیدا کاری سوکی پێ ئەسپارد، هەر کە

لەسەر کارەکەی تەواو بووایە داوای مۆڵەتی دەکرد، زۆر جار لەسەر کارەکەی دوو سەعاتی پێنەدەچوو، ئیتر هەموو کاتەکانی تری لای ژنەکەیەوە بەسەردەبرد و خۆی خواردنی دەدایە و دەینا بە سنگیەوە و چیرۆك و رۆمانی بۆ دەگێرایەوە و بە تێپەڕبوونی رۆژگار، ئازارەکانی ئەویش زیادی دەکرد و مێردەکەشی هەوڵی دەدا لە ئازارەکانی کەم بکاتەوە، ژنەکە سندوقێکی بچوکی دا بە پەرستارەکە و داوای لێکرد کە پارێزگاریی بکات و نەیدا بە هیچ کەس بە مێردەکەی نەبێت، ئەویش دوای وەفاتکردنی.

رۆژی دووشەممە بوو سەر لە ئێوارە و دوای نوێژی عیشا، کەش و هەوا باراناوی بوو، دەنگی دڵۆپەی باران دەهات، کاتێك کە دەیکێشا بە پەنجەرەی ژوورەکەدا دڵی دەهێنایە جۆش و هاورێکەشمان شیعری دەچڕی بۆ خۆشەویستەکەی و دەیڕوانیە چاوەکانی، ئەویش تەماشایەکی خواحافیزیی بە خەندەوە ئاراستە کرد... فرمێسك بە چاوانی مێردەکەیەوە هاتە خوارەوە چونکە دەرکی بەوە کرد کە سەعاتی سفر نزیکە، ژنەکە دوای خەندەکە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و لەگەڵیدا گیانی بەرزەفڕ بوو... خەریك بوو لە ئاست ئەو دیمەنە دڵتەزێنە

گیانی مێردەکەشی بەرزە فڕ ببێت.. نامەوێت دڵی خۆم و ئێوەش بێتاقەت بکەم، کە پاش وەفاتکردنی، مێردەکەی چیکرد ، بەڵام دوای نوێژکردن لەسەری و ئەسپەردەکردنی بە دوو رۆژ، ئەو پەرەستارە ئافرەتەی چاودێری حاڵەتی ژنەکەی دەکرد ، دڵخۆشیی مێردەکەی دایەوە و سندووقە بچووکەکەی پێ سپارد و پێی ووت کە ژنەکەی داوای لێکردووە دوای وەفاتکردنی ئەم سندووقە بپسێرێت بە مێردەکەی... ئایا لەناو سندووقەکەدا چی تێدا بوو؟! شوشەیەکی بەتاڵی عەتر کە یەکەمین دیاری بوو مێردەکەی پێشکەشی کردبوو، دوای زەماوەند کردنیان و وێنەیەکی خۆی کاتی زەماوەندەکە و دەستەواژەی(بۆ خوای گەورە تۆم خۆش دەوێت) کە نەخشێنرابوو لەسەر روویەکی لاکێشە.بێگومان مەزنترین جۆرەکانی خۆشەویستی ئەوەیە لەبەر خوای گەورە بێت و نامەیەکی بچوك کە وەکو خۆی بۆتان دەگوازمەوە لەگەڵ رەچاوکردنی لابردنی ناوەکان و گۆڕینی پەیوەندی خزمایەتیان.

نامەکە" مێردی بەهادار و سەنگینم، دڵتەنگ مەبە بە جیابوونەوەی من، بە خوا ئەگەر تەمەنێکی ترم بۆ بنوسرێت ئەوە لە گەڵ تۆدا دەستی پێدەکەم، بەڵام تۆ

شتێکت دەوێت و منیش شتێکم دەوێ و خوای گەورەش ئەو کارە دەکات کە خۆی دەیەوێت.

برام فلان، من خوازیارم کە بە زاوایی بتبینم پێش مردنم ، خوشکم فلان خراپ مەبە لەگەڵ منداڵەکانتدا بە لێدان، چونکە ئەوانە خۆشەویستی خوان و کەس هەست بەو رۆزیە ناکات مەگەر کەسێك لەدەستی چووبێت.. پورم فلان (دایکی مێردەکەی) هەڵوێستێکی باشت نواند، کاتێك داوات لە کوڕەکەت کرد کە بێجگە لە من بخوازێت، چونکە شایانی ئەوە کە باشترین نەوە- پشت بەخوا- ناوی ئەو هەڵگرێت.

ووشەی کۆتایی بۆتۆ ئەی مێردی خۆشەویستم، ئەوەیە کە دوای وەفاتی من ژن بهێنی و هیچ بیانوویەك نەماوە، خوازیارم کە یەکەمین کچت بەناوی منەوە ناو نابێت و بزانە کە من غیرە بەرامبەر ژنە نوێیەکەت دەمگرێ، تەنانەت با لە ناو گۆڕەکەشدا بم"

## چیرۆکێکە لە خەیاڵ و ئەندێشەشدا نیە

ئافرەتێك لە قۆناغی چوارەمی تەمەنیدا بوو.. خاوەنی ماڵ و منداڵ بوو.. نزیکەی چواردەساڵە پابەندە بە تەعالیمی ئیسلامەوە، بەڵام دەوروبەرەکەی هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوون دووری بخەنەوە لەو رێگایە، بەڵام خوای گەورە کۆمەکیی دەکرد و ئاگاداری نیازی پاکی بوو، بۆیە بەردەوام پارێزگاری دەکرد و رۆژانە ئیمان و باوەڕی زیاتری دەکرد بە فەزڵی خوای گەورە... سەدان کتێبی خوێندبووەوە سەبارەت بە عەقیدە و پەروەردە و فەرموودە و فیقه زۆرێك لە زانایانی وەك ابن تیمیة و ابن القیم الجوزی و محمد بن عبدالوهاب و ابن الحجر العسقلانی و عبدالرحمن الدوسری و سید قطب و کتێبی زۆر، کە ناتوانم بیانژمێرم بۆتان و هەروەها کاسێتی کۆمەڵێ زانای ناودار، ئەمە بە نیسبەت بواری خوێندنەوەوە.

بە نیسبەت بەسەربردنی کاتەکانی بەم شێوەیە بوو، بەیانیان سەعات دە ونیو هەڵدەستا و نوێژی چێشتەنگای دەکرد بۆماوەی نیو سەعات و پاشان دەچووە مەتبەخەوە و

پاشان نوێژی نیوەڕۆ و سونننەتەکانی پێش و پاش نیـوەڕۆی دەکرد و دوای ئەوە قورئانی دەخوێند، هەر شـەش ڕۆژ یـان حەوت ڕۆژ جارێك خەتمی قورئـانی دەکـرد، پاشـان کـاتی عەسر نوێژەکەی دەکرد و پاشانیش کتێبی دەخوێندەوە، ئەو لە شەودا تەنیا دوو سەعات دەخەوت، ئیتر هەموو شەوەکە هەڵدەستا تا خۆر کەوتن، پاشان دوو رکات نوێژی دەکرد و دەخەوتـــەوە.. لـــە ڕۆژو و گرتنیـــشدا وەکـــو داود پێغەمبەرمانﷺ ڕۆژووی دەگرت، بەڵام ئەگـەر ڕەمـەزان بهاتایە لە لای ئەو بە شێوازێکی تر بوو.

چونکە دوو ڕۆژ جارێك خەتمی قورئانی تێـدا دەکـرد تـا بیـــستەم ڕۆژ بەوشـــێوەیە بـــوو.. وە دە ڕۆژی کۆتـــایی ڕەمەزانیش هەموو ڕۆژێك خەتمی دەکرد و لە سەر پێکـانی دەوەستا لە دوای نوێژی عیشا هەتا پێش بانگی بەیانی بـە نیو سەعات... پاشان پارشێوی دەکرد و نوێـژی دەکـرد و دەخەوت ، ئەگەر زۆر بخەوتایە تەنیا (٤) سەعات لە ڕۆژدا دەخەوت، بە تایبەتی لە دە ڕۆژی کۆتایی.

سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا لەم سەردەمەی ئێمەدا ئافرەتمان هەیە بەو شێوەیە بێت؟ تکا دەکەم وەڵام بدەنەوە... ئەم ئافرەتە هەڵیش دەستا بە یارمەتیدانی خێزانە هەژارەکەی بە خواردن و پۆشاك و هەر شتێك لە توانایدا بوایە و هەروەها بانگخوازیش بوو، بەڵام بە کڕینی کتێب و کاسێت و دابەشکردنی بەسەر خەڵکیدا.

بەڵام خوشکانی بەڕێز: لە هەموو ئەمانە گرنگتر، ئەم ئافرەتە لەناو خەڵکانێکدا دەژیا کە هەموویان دەیانوویست بێباوەڕی بکەن، تەنانەت پێیان دەوت سیحر و جادوت لێکراوە، قورئان خوێنیان بۆ دەهێنا، دەیووت هیچی نیە، بەڵام ئەمان بڕوایان پێنەدەکرد، جارێکیان فێڵیان لێکرد و پێیان ووت: بۆ خواردنی ئێوارە دەڕۆین بۆماڵی خزمێکمان، ئەوانیش بردیان بۆ لای شارەزایەکی ئەو بوارە، پیاوەکە ملی گرت و بە هاوکاری مندالەکانی و مێردەکەی ئەوەندە پەستانی خستەسەر ملی کە خەریك بوو گیانی دەربچێت، دەپاڕایەوە لە مندالەکانی کە رزگاری بکەن، بەڵام کەسیان وەڵامیان نەدەدایەوە، ئەم هەر

ئارامی دەگرت لە سەر ئەو هەموو ئازارە لە پێناوی ئایینەکەیدا.

پاشان لێیاندا و بردیان بۆ نەخۆشخانە و بە هۆی کاریگەری لێدانەکەوە نەشتەرگەریان بۆ کرد، بەڵام وازی لە ئایینەکەی نەهێنا و بەڵکو زیاتر ئیمانی پتەوتر دەبوو، ئەوان هەر بەردەوام بوون تا لە سەر ڕێگای راستەقینە لایبدەن و وەکو ئەوان بێت و خەریکی گاڵتەوگەپ و باوەشکردن بە دونیا و ڕۆشتن بۆ شوێنە تێکەڵاوەکان و خۆ سەرخستن بێت، بۆیە بەردەوام لە ململانێدا بوو لە گەڵیان و تاکە پەناگە کە پەنای بۆ ببردایە خوای گەورە بوو.

ئەمە ئەو مەینەتیە مەزنە بوو کە ئەو ئافرەتە تێیدا دەژیا.

خوشکانم: مەبەستم لەم باسکردن و بەسەرهاتە هەرگیز ناوبانگ دەرکردن نیە، بەڵکو بەرزکردنەوەی ورە و هێمەتی ئێوەیە و ئارامگرتنتانە بە تایبەتی ئەوانەمان کە بەرەو رووی هێرش دەبینەوە لە سەر ئاینەکەمان، چونکە ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە بۆ دروستکراوەکانی و

پێویستە تاقیبکرێنەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت (أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ(٢)وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ) العنكبوت/١-٢) واتە (ئایا خەڵك وادەزانن کە وازیان لێدەهێنرێت ئەگەر بڵێن بڕوامان هێناوە، ئیتر ئەوان تاقی ناکرێنەوە، سوێند بەخوا بێگومان کەسانی پێش ئێوەشمان تاقیکردووەتەوە و ئەمانیش تاقی دەکەینەوە، ئینجا بیگومان خوا ئەو کەسانەی راستیان کرد دیاری دەکات و درۆزنەکانیش دیاری دەکات)

ئەمە چیرۆك و بەسەرهاتی ئەو ئافرەتە بوو کە بۆم باسکردن، وەك چۆن خۆی بۆی گێڕامەوە، ئەو ئافرەتەو هەموو ئەو کارانە دەکات و ئێمەش!!

فرسەتتان بۆ بەجێ دەهێڵم تا هەر یەکە لە ئێمەش پێداچوونەوەی خۆی بکات و لە خۆی بپرسێتەوە و بزانێ چی پێشکەش بەم ئایینە مەزنە کردووە.

لە کۆتاییدا داواکارم و خوازیارم لە هەر یەکێك لە ئێوە کە رووبکاتە خوای گەورە و بپاڕێتەوە و دووعا بۆ ئەو ئافرەتە بکات تا خوای گەورە دەرووی لێبکاتەوە و رزگاری بکات لە مەینەتی و نارەحەتیەکان کە تێیدا دەژی.

## رقم لە دایکمە

دایك سەرچاوەی سۆز و خۆشەویستیە و دایك دڵنیـایی و بەختەوەریی و دڵئارامیە و تیماری بیماریـە و هـەروەها لەوانەیە هۆکاری ئەوە بێت کە هەموومان ماڵی خۆمانمان خۆش دەوێت.. لەبەر ئەوە شتێکی سروشـتیە کـە خـەڵکی دایکانی خۆیان خۆش بووێت و هـەرگیز سەرسـام نـەبیت کاتیێ: گوێت لە یەکێکەوە بێت بڵێـت کـە بەراسـتی مـن دایکم زۆر خۆش دەوێت، بەڵام هەڵویستی تـۆ ئـەی بـرا و خوشکم چی دەبێت ئەگەر گوێت لە کەسێکەوە بێت بڵێـت من رقم لە دایکمە، ئاواتی مردنی بۆ دەخـوازم، ئایـا لـەو بڕوایەدان هۆکارێ هەبێ پاڵ بە کەسێکەوە بنێت کە وا بە دایکی بڵێت.

بە داخـەوە گـوێم لـە هاوڕێکمـەوە بـوو لـە قۆنـاغی دواناوەندیدا پێی وتم: من رقم لـە دایکمـە، زۆر سەرسـام بووم، خەریك بوو چەپۆکێکی پێدا بکێشم، بـەڵام قیژانـدم بە رووخساریدا و وتم: شتی وا نابێ.. شتی وا نەڵێبت.. خـۆ

تەنها من قسەکەی ئـەوم رەت نـەکردەوە، بـەڵکو هـەموو هاورێ کچەکانی تری، کاتێ گوێیان لـەو قـسەیەی دەبـوو دەیانقیژاند بەسەریدا.. ئایا بڕوا دەکەن ئـەو رازی نـەدەبوو هیچ دەربرینێ بنوسێت کە پەیوەندی بە دایکەوە هەبوایـە، ئەگەر لە قوتابخانە داوای لێبکرایە باسـی دایکـی بکـات ئەم باسی خراپی و دڵڕەقی دایکی دەکرد.

رۆژێکیـان نزیك بوومەوە لێی و تەنها مـن و ئـەو لـە پۆلەکەدا بووین، لێم پرسی هۆکاری ئەو هەموو رقە چـیە بەرامبەر بە دایکی، بەڕاستی وەڵامەکەی تووشـی شـۆکی کردم و منیش پەشیمان بوومەوە کـە قیژانـدم بەسـەریدا، ئـەو دوو دڵ نـەبوو لەباسـکردنی بەسـەرهاتی و ئـازار و مەینەتی خۆی لە گەڵ دایکیدا و وام هەسـت دەکـرد کـە لەو رۆژەوە ئاواتەخوازە کـە یـەکێك ئـەو پرسـیارە بکـات سەبارەت بە ئازارەکانی، تاوەکو دەرفەتی بۆ بڕەخسێت کـە ئازارەکانی سووك بکات، کە کەڵەکە بووبـوو بەسـەریەوە، بۆیە لەوکاتەدا کە هەستم کرد تەنیایە پێی وتم بـە هـۆی شتێکەوە باوکم دایکمی تەڵاق دا مـن ئەوکاتـە شـیرەخۆرە

بووم خوشك وبرای گەورەم هەبوو، دایکم لـە مـاڵی بـاوکم چوویە دەرەوە و رازی نەبوو هیچ منـاڵێك لـە گـەڵ خۆیـدا بەرێت، تەنانەت منیش کـە شـیرەخۆرە بـووم، رازی نـەبوو بمبـات دوای تێپـەربوونی ماوەیـەك بەسـەر دەرچـوونیا نەخۆشیەکی سەختم گرت، باوکم بردمی بۆ لای ئەو، بەڵام ئەو رازی نـەبوو بمگرێـت یـان لـە ماڵەکەیـدا پێشوازیم لێبکات.

باوکم وتی: ئەمە کـچی تۆیـە نامـەوێ بـڕۆم و خـۆت بەخێوی بکە.

باوکم منی هێنایەوە بـۆ مـاڵـەوە و ئێمـەش لـە گـەڵ باوکماندا دەژیاین، باوکم گرنگی بە هەموو کاروبارەکانمان دەدا هەتا گەورە بووین.

دایکم بیری لـەوە نـەدەکردەوە کـە تەنانـەت بـۆ یـەك جاریش سەردانمان بکـات، هاوڕێکـەم ووتـی: دوای ئـەوەی خوشـکە گەورەکـەم شـووی کـرد سـکی بـوو، لـە کـاتی منداڵبووندا بارودۆخی زۆر نارەحەت بوو لە نێوان مـردن و ژیانـدا بـوو.. داوای کـرد کـە دایکـم ببینـێ، ئێمـەش

پەیوەندیمان بە دایکمانەوە کرد. تاوەکو بێت و بیبینێت بەڵام دایکم هەرگیز رازی نەبوو کە بێت و تەنانەت پەیوەندیشی نەکردەوە تا بزانێت خوشکەکەم چۆنە... ئەمە کورتەی بەسەرهات و مەینەتی هاورێکەم بوو، منیش بەراستی رەچاوی بارودۆخەکەیم کرد، دایکم حەز بە بوونی من نەکات و منی خۆش نەوێت ئیتر من دەتوانم چی بکەم.. ئەگەر کەسێکی غەریب و نامۆ پەیوەندی نەبێ پێمانەوە ئەوە بێتاقەت دەبێ بۆیە هەست بە بێتاقەتی و بە سوکی و ماتەمی دەکەیت، ئەی راتان چۆنە بەرامبەر نزیکترین کەس کە ئەویش دایکە ؟

بەراستی من دەرم نەخست کە رق و کینەی هاورێکەم لە جێی خۆیەتی بەڵکو پێم وت هەرشتێکی کردبێت لە گەڵت ئەو هەر دایکی تۆیە و پێویستە رێزی بگریت و خۆشت بووێت و سەردانی بکەیت، تەنانەت با ئەویش تۆی لەبیر کردبێت... من هەمیشە هەوڵمدەدا کە وای لێبکەم بەهانە بۆ دایکی بهێنێتەوە و چاوپۆشی لە هەڵسوکەوتی

بکات.. من بۆ ماوەی ساڵێك خەریکی هەوڵدان بووم لە گەڵیدا، بەڵام بێ سوود بوو، چونکە برینەکەی زۆر گەورە بوو.

## لەزەتێك کۆتاییەکەی تاڵە

خۆیان بینیەوە رووبەرووی یەکتری بوونەتەوە لە گەڵ حەز و ئارەزوویەکی زۆردا، کە بەرەنگاربوونەوەی حەرام شکست پێ دێنێ، هەردوولا ئەو خۆڕاگریەی کە پێویست بوو هەبێت نەما، بۆیە لاوازیی مرۆیی زاڵ بوو بەسەریاندا، کە سیفەتێکی ئەو قۆناغەی تەمەنە.

بەڵێ نائۆمێدی بەهەموو جۆرەکانیەوە کۆبوویەوە و ئێسکی مرۆڤی دەشکان، ئەم کچە مافی ئەوەی نەبوو شکاتی حاڵی خۆی لە کەس بکات، ئایا لە کێی بکات؟ خۆی زاڵم و زوڵم لێکراوە.

لە راستیدا هاوبەشێکی هەبوو، بەڵام ئێستا کوا هاوبەشەکەی، تەنانەت ئەگەر ببێت ئایا دەتوانێت بەشێك لە ئازارەکانی ئەم لابەرێت، یان ئەو ئازارە هەڵگرێت لە

گەڵیدا کە بە هۆیەوە ئاسۆی بەردەمی دادەخرێت و دەروازەی ئومێدەکانی لێبوردنیش دادەخرێت؟ ئەو بە هۆی تاوانەکەیەوە شەرمی کرد و داوای لێبوردنیش لە خودا بکات ..

بەڵێ ئەوە ساتێکە کە شتەکان پارچە پارچە دەبن و پاشماوە بەجێ ناهێڵن، هەموو خانەیەکی لەشی پێشوازی لە کۆرپەلەیەکی تازە دەکات، مەزنترین ئازارەکان کە تێکەڵە بە خۆشی بۆ بەدیهێنانی ئەزموونی موعجیزەی مرۆڤایەتی، بەڵێ ئافرەت چەندین مانگ ئەو کۆرپەلەیە لە سکیدا هەڵدەگرێت کە نزیکترین شتە لێیەوە.

بەڵام ئەم وەکو دایکەکانی تر نیە کە گوزارشت لە مەزنترین ساتیان دەکەن لە ژیانی دایکایەتیدا، ئەم هەموو ساتێکی گەورە بوونی کۆرپەکە بەڵایەکی نامۆیە لە جەستەیدا.

ئەم کائینە نابێت بمێنێت، چونکە بوونی پێچەوانەیە لە گەڵ مانەوەیدا، بۆیە پێویستە بسڕێتەوە و زاڵ بێت بەسەر شوێنەواریدا، وە پێویستە خۆی بە تەنها هەڵبستێت بەو

کارە، پێویستە بە دەستی خۆی کۆتایی بەو جگەرگۆشەیە بێنێت لە بووندا.

لەوپەڕی ئازار و ناخۆشیدا رووخساری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و داوای یارمەیی دەکرد، پاك و بێگەردی ئاسمان و ئەستێرەکانی بینی، بەڵکو تاوانەکەی خۆیی بینی کە ئاسۆی لەبەرچاوی ئەم شاردبوویەوە... بۆیە هاوارێکی شاراوەی کرد کە گوزارشت بوو لەو بێ ئومێدیەی ناخی، رازی نەبوو بێ ئومێد بێت لە رەحم و بەزەیی خوا، بەوپەڕی بیناییەوە تەماشایکرد بۆیە، رووبەرێکی تەسکی ئاسمانی بینی فرمێسك بە چاوانیدا هاتەخوارەوە و داوای لێخۆشبوونی بۆ مرۆڤێك دەکرد کە تاوان زاڵ بوو بەسەریدا، بە دڵی کەوتە دواندن لە گەڵ پەروەردگاری.

ئەکرێ ئەوە ساتانێك بێت لە شەپۆلی بەختیاری و خۆشیی کە دابەش بووبێ بەسەر تاکەکانی خێزانەکەیدا کە ئیستا ئازارەکانی شاردووەتەوە لێیان، بەڵام هەمیشە بێسوودە کاتێ کە کار لە کار دەترازێ، هەموو شتێ بەو شێوەیە دەگوزەرا کە ئاواتی دەخواست، کاتێ کە بە هۆی

نزیکی و دراوسێیەتی گەڕەکەوە پەیوەندی دروست بوو لـە گەڵیـدا، چـونکە هـەموو ڕۆژێ ڕادەبـوورد بـە بـەردەم قوتابخانەکەیدا کە دواناوەندی بازرگـانی بـوو، پاشـان لـە دوورەووە بە دوایدا دەرۆشـت، هـەوڵی نـەدەیا لێـی نزیـك بێتەوە یان قسەی لەگەڵدا بکات، بەڵام جێگـای سـەرەنجی بوو، هەتا ڕاهاتبوو کە بگەڕێ بـەدوای چارەنووسـیدا لـەو شوێنەدا کە کوڕەکە تێیدا ڕادەوەستا.

هەرکە کچەکە دەهاتـەدەر لـە قوتابخانـە، دەکەوتـەڕێ بەرەو مـاڵەوە بە بێ ئەوەی هاوڕێکانی بزانن چی ڕوودەدات، ئەگەر کوڕەکەی ببینیایە دڵنیا دەبوو، ڕۆژێکیان نەیبینی، وای هەست دەکرد شتێکی ونکردووە و هەروەها بـۆ ڕۆژی دووەمیش نەیبینی، بـەو شـێوەیە تـا کۆتـایی هەفتەکـە نـەیبینی، خـەریك بـوو لـەبیری دەچـوویەوە ئەگـەر ڕۆژی یەکـەمی هەفتـەی داهـاتوو نەیبینیایـە، خەندەیـەکی ئاراستە کرد و ملی جوڵاند و بۆ ماوەیەکی زۆر تەماشـای کوڕەکەی کرد... ئاسەواری ئەوەی بینی کە خۆیشی دیاربوو بە ڕووخساری کوڕەکەوە، جیابوویەوە لە هاوڕێکـانی و بـە

ڕێگایەکی تردا ڕۆشت.. کوڕەکەش دوای کەوت تا گەشتە ئاست و تەنیشتی و بە بێ ئەوەی کچەکە پرسیاری لێبکات وتی: من نەخۆش بووم و زۆرم حەز دەکرد کە بتبینم... دەستیان کرد بە قسەکردن وەك ئەوەی سالآنێکە یەکتری دەناسن.. بینینەکان زیادیان کرد و کچەکە بۆی دەرکەوت ئەویش وەك خۆی وایە و دیبلۆمی دواناوەندی هەیە لە بازرگانیدا، باوکی دایمەزراندووە و فەرمانبەرێکی سادەیە لە فەرمانگەکەیدا... وای هەست دەکرد کە لە فەرمانگەکەدا کۆت کراوە، چونکە حەزی دەکرد لە گەڵ باوکیدا بمێنێتەوە لە بازرگانیکردن لە مۆبیلیاتی میللیدا... بەڵام باوکی نەیهێشت وازبهێنێت... دەبوایە ئەم کوڕە ژنی نەهێنایە تا پێنج ساڵی تر، تاوەکو پارە کۆبکاتەوە لە مووچە کەمەکەی، تا بەشی مارەیی یان پارچە ئاڵتونێك یان پێداویستی ژنهێنان بکات، چونکە باوکی خاوەنی چەندین کوڕ و کچ بوو، نەیدەتوانی یارمەتی کوڕەکەی بدات مەگەر لە سنوورێکی تەسکدا بەڵام نەیدەزانی چۆن لەو بەرنامەیە دەرچێت کە لە گەڵ

باوکیدا دایـنابوو، کچەکە تەواو سەرنجی ئەمی راکێشابوو بۆیە کوڕەکە تیامابوو، نەیدەزانی چی بکات، کاتێ لە کچەکەی پرسی: ئایا دەتوانێ بڕوات بۆ ماڵیان داوای بکات یان نا؟ وە کەی؟

لە پڕ کچەکە خەفتبار بوو، سەری داخست و ماتەمیەکی تەواو بە قسەکانیەوە دیاربوو، وتانێکی ووت کە ئەوی خەمناك کرد، سۆزی جولاّ بۆی و چەند جارێ کچەکە فرمێسکی سڕی، گەر هەردووکیان لە شوێنێکی گشتیدا نەبوونایە باوەشیان بە یەکدا دەکرد تا خەم و خەفەتی نەهێڵێت!

وتی من لە دوو ماڵدا دەژیم، بەرۆژدا لە ماڵی دایکمدا دەژیم کە شووی کردووە بە پیاوێکی تر و بەشەویش لە ماڵی باوکم ئەویش بۆ راپەراندنی رێکەوتنی نێوانیان، چونکە باوکی حەز ناکات کچەکەی لە ماڵی پیاوێکی تردا بێت و دایکیشی ئیتر حەز ناکات لە مێردەکەی تری منداڵ و کچی ببێت... ئەم منداڵی گەورەی ئەوانە... ئەم لە ناو هەمووانـدا بەناز و عەیار بوو تا

ئەوکاتەی کارەسات روویدا و دایکی تەلاّقـدرا، ئـەو کاتـە تەمەنی ئەم دەساڵ بـوو، پاشـان نارەحەتیـەکان دەسـتیان پێکرد.

باوکیی ئـافرەتێکی تەلاّقـدراوی مـارەکرد، ئافرەتەکـە کوڕێکی ناصالّحی هەبوو کە لە دواناوەندی گشتیدا بـوو، ئەو لە شەقامەکانەوە پەروەردە بووبـوو، حـەزی لـە سـەر شەقام و دانیشتنی ناو قاوەخانەکان بوو ئیشێکی بۆ خـۆی داهێنا بـوو، بـۆ هاورێکـانی بووبـوو بـە نموونـە ئـەویش کۆکردنەوەی چەند کەسێك بوو لە حانووت و قاوەخانەکان، ئەوانەی هەڵدەستن بە خۆشـیەکان و ماتەمیـەکان، سـەیر لەوەدا بـوو دایکیـشی شـانازی پێـوە دەکـرد، دایکیـشی کـۆنترۆڵی گەڕەکەکـەی کردبـوو وە کـۆنترۆڵی باوکیـشمی کردبوو و دەیویست من شوو بە ئەو بکەم.

بەلاّم بـاوکم پـشتی منـی دەگـرت، کەچـی ژیـانێکی سامناکم دەبردە سەر کاتیٚ لە ژوورەکەی خۆمـدا دەخـەوتم هەموو شەوێك دەرگاکەم لە ژوورەووە دادەخست... زۆر باشە من مەوعیدێکت لە باوکمەوە بۆ وەردەگرم، چونکە ئەگـەر

باوەژنەکەم بزانێت بە هەر شێوەیەك بێت کۆسپ دەخاتە بەردەممان و کاریگەریی لە سەر باوکم هەیە و ژیانی تێکدەدات.

کچەکە نەیدەزانی ئەم جۆرە قسەکردنانە بە راشکاوانە وای لێدەکات زیاتر هۆگری بێت یان بیر لە پاشەکشەکردن نەکاتەوە پیش ئەوەی هەڵوێست وەربگرێت، سۆزداریەکەی وایلێکرد بەزەیی پێدا بێتەوە و وایلێکرد کە لە دەسەڵاتی کچەکەدا نەبوو، بیبات بۆلای باوکی و بیخوازێت لێی، چونکە پێویستە بیشیبات بۆ لای دایکی و کە زیاتر دایکی حەزدەکات شوو کردنەکەی لە رێگەی ئەوەوە بێت و مافی باوکیشیەتی ئامادەی زەماوەند بێت، بۆیە بڕیاری خوازبێنی درا.

پێکەوە رۆشتن.. ئەگەر شەو دواکەوت ئەڵێت لای دایکی بوو و ئەگەر رۆژ دەرنەکەوت دەڵێت لای باوکی بووە و ئەو بارودۆخەی بۆی رەخساندن کە بە ئارەزووی خۆیان بگەڕێن بە ماڵی هاورێ کوڕ و کچەکاندا و هەموان لە هەوڵدا بوون کە بگەڕێن بۆ جێگایەکی نیشتەجێ بوون بۆ

ئەم دوو دەزگیراندارە.. باوکیشی رازی بوو بەرنامەکە کورت بکاتەوە و بە پێی توانا یارمەتی بدات.

لە ژێر چەتری دەزگیرانداریدا بۆیان رەخسا کە بە ئارەزووی خۆیان یەکتری ببینن، چەند هەفتەیەکی نەخایاند بەرەو رووی یەکتری بوونەوە، کورەکە داوای کرد کە خێزانی بگوازێتەوە، بۆیە لەم بەینەشدا باوکی کچەکە نەیدەویست ژنەکەی بزانێت تاوەکو کارەساتی لێنەکەوێتەوە، هەموان بە دوای شوێنێکدا دەگەڕان... بەڵام بێ سوود بوو.

هەموان شەکەت بوون لە گەڕاندا، دایکیشی بە دوای هۆکارێکدا دەگەڕا کە رزگاریان بێت لەو شەرمەزاریە، کچەکەش تۆقیبوو لەگەڵ ئەندێشەکانیدا سەفەری دەکرد و بە خەمەکانیەوە دەگەڕایەوە.. جارێ لە مردن دەترسا و هەزار جاریش لە حەیا چوون، ئازارەکانیش دەبارین و ئومێدی خانوو و لە گەڵ لەباربردنی کۆرپەلەکەدا کە ئیتر لەباربردن سەختتر دەبوویەوە، چونکە دایکەکە و کورپەلەکە دەکەوتنە ژێر مەترسیەوە، بۆیە ئافرەتەکە

چۆکی دادا، چاوەڕوانی بەلاّ و رزگاربوون بوو، کار لە دەستی ئەوان دەرچووبوو...

پێش ئەوەی مانگی نۆ کۆتایی بێت، لە پڕ تەنها لە ژوورەکەی خۆیدا هەستی بە ئازارەکانی منداڵبوون کرد و ئارامی زۆری هەبوو کە نەیدەزانی لە کوێوەیە، سوپاسی خوای کرد، چونکە کەس لە ماڵەوە نەبوو وە نەیدەویست کەس بەم فەزاحەتە بزانێت.

ئازاریش سات نا ساتێك بەرۆکی بەرنەدەدا ... دڵنیابوو کە وردە وردە بەرەو مردن دەڕوات، کۆرپەلەکە رێگای خۆی گرتەبەر، بۆیە لە دامێنیەوە هەستی بە شتێك کرد، خەریك بوو لە هۆش دەچوو، منداڵێکی لێکەوتە خوارەوە و دەجولاّیەوە، دەیویست پڕ بە بینی هاوار بکات، بەلاّم دەستی خستە دەمیەوە تا دەنگی نەیەت، هاوار و ئازارەکانی لە هۆش خۆیی برد .. نەیزانی بەرەو کوێ... وای زانی بۆ ساتێ یان چەند ساتێ لە هۆش خۆی چووە.

کاتێ هۆشی هاتەوە خۆی، بینیی لە مەینەتیەکی بچوکەوە کەوتە مەینەتیەکی گەورەوە، منداڵەکە نەهاواری

دەکرد و نەهەناسەی دەدا، چونکە ماڵئاوایی لە ژیان کردبوو، هەستا بە بێ عەقڵیەوە خۆی لەو کارەساتە رزگار بکات، تەماشای کرد منداڵەکە کچە، بەسەر ئەو هەموو حاڵەتەدا سوور بوو لەسەر ئەوەی بزانێ چ رەگەزێکە!! پێچای لە چەند پۆشاکێکی کۆنەوە و بردی لە جێگایەك داینا و گەڕایەوە بۆ سەر جێگاکەی خۆی، تا هەموو ئاسەوارەکانی لابەرێت و بە خەڵکی نیشان بدات کە تەنها نەخۆشە.

منتديات المسافر

## زەینەب غەزالی لە شەپقەوە بۆ حیجاب

زەینەب غەزالی ئەو ئافرەتەیە کە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەسپێت بەسەریدا: [خِيَارُكُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الإِسْلامِ إِذَا فُقِهُوا] واتە: چاکترینتان لە سەردەمی جاهیلیەت و نەفامیدا چاکترینتانە لە سەردەمی ئیسلامەتیدا، ئەگەر تێبگەن.

پێش پابەند بوونی بە ئیسلامەوە ئاگرێکی بڵێسەدار بوو، زمانێکی بوێر بۆ وتنی ناهەق و بەرگریکردن لێی، چونکە پێی وابوو کە ئەوە هەق و راستیە، پاشان هەر کە رووناکی بینی، لە پابەندبوونیدا کەسێکی بەتواناتربوو تا پێشتر، ئەو ئێستا پایەیەکی کاری ئیسلامی ئافرەتانە لە نیشتمانی عەرەبی گەورەدا... بە هەموو دڵسۆزیەکەوە کاری کردووە بۆ ئەوە و ئێستاش بەردەوامە.

## نوسەیبەی کچی کەعب

(زەینەبی کچی محمد غەزالی الجیبلی) لـە(٢)ینایـەری ١٩١٧ز لە دایك بوو لە یەکێ لـە گونـدەکانی پارێزگـای (البصیره) لە (میسر)، باوکی لە زانایانی ئەزهەری پـیرۆز بووە، پەروەردەی کرد لە سەر خۆ نەویستی و خێر و چاکە و رەوشت بەرزی وە ئامادەباشی کردبوو بۆ پێشەنگی و بوێری لەسەر هەق و راستگۆیی و وەستان لەبەرامبەر زوڵمدا، وە نـــاوی نـــابوو(نوســـەیبە)بـــۆ پـــیرۆزی هـــاوەڵی خۆشەویست(نوسەیبەی کچی کەعبی المازنی ئەنصاری)کە بە جوامێری بەناوبانگ بووە، یەکێ بووە لە پاڵەوانەکانی جەنگـەکان، لـە رۆژی جـەنگی(ئوحـود)دا نارەحەتیـەکی سەختی بەرسەردا هاتبوو، لە دوانزە شوێنەوە بریندار بـوو بوو، یـەکێ بـوو لـە خۆڕاگرەکـان لـە گـەڵ پێغەمبـەری خوادا ﷺ کاتێك خەڵکەکە کشانەوە.

کاتێك باوکی ویـستی ئـەم کـچەش بـشوبهێنێت بـەو هاوەڵـە بـەرێزە مەبەسـتی ئـەوە بـوو کـچە منداڵەکـەی

رابهێنێت لە سەر خۆشەویستی و جیهاد و بەرگریکردن لە ئیسلام و لە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی بەڕێزی.. شمشێرێکی لە تەختە بۆ درووستکرد و بە تەباشیر لە سەر زەویەکە بازنەیەکی بۆ کێشابوو، وتی: بوەستە و لە دوژمنانی پێغەمبەرﷺ بدە، ئەویش لە ناوەراستی بازنەکەدا وەستاو و بە راست و چەپ و پێش وپاشدا شمشێری دەوەشاند... کاتێ باوکی لێی پرسی: چەند دوژمنی پێغەمبەری خوات کوشتﷺ ئەویش شمشێرەکەی لە هەوا داو وتی دوو سێ چوار بەوشێوەیە.

- **مردنی باوکی:**

ژیانی خۆشی منداڵیەتی درێژەی نەکێشا دوای وەفاتی باوکی کە هانی دەدا بۆ بەرگری لە ئایین و دروستکردنی، کاتێ کە تەمەنی دە ساڵان بوو بۆیە هەستی بە لەدەستدانی خەون و ئومێدەکانی دەکرد، پاشان دایکی گواستیەوە بۆ قاهیرە تا لە گەڵ ئەو خوشکانەیدا بژی کە لەوێ دەیانخوێند و کاریان دەکرد، ئەمیش حەزی دەکرد خوێندنەکەی تەواو بکات.. (محمد)ی براگەورەی رێگری

دەکرد.. کاتێ دایکی باسـی ئـەوەی لـە گـەڵ کورەکەیـدا دەکرد بە دایکـی دەوت: بەڕاسـتی زەینـەب بـاوکم فێـری جوامێری کردووە و فێری ئەوەی کردووە کە تەنها گوێ لـە دەنگ و عەقڵی خۆی بگرێـت!! لەبەر ئەوە مـن رازی نـابم خوێندن تەواو بکات تا من سەرپەرشـتیاری بم، ئەوەنـدەی بەسە کە لە قوتابخانەکانی لادێدا فێری بووە.

هەڵوێستی (محمـد)یەکـەمین گـۆڕان بـوو لـە ژیـانی زەینەبدا دوای وەفاتی باوکی، چونکە ئەم رەزامەنـد نـەبوو بە هەڵوێستی براکەی، دایکیشی پێی دەوت: پێویستە بـە گوێی براکەت بکەیت چونکە لە جێی باوکتە.

لـە نێـو ئـەم سەراسـیمە بوونـەدا (عـەلی) بـرای یارمەتیدەری بوو، کە برای دووەمی بوو، لەسـەر بـەردەوام بوون لەسەر هەڵوێستەکەی، چونکە بۆچوونی باوکی وابوو کە خوێندنەکەی دەبێتە هۆی بەهێزبوونی بیروبۆچوونەکەی و دید و بۆچوونی بۆ شتەکان و خەڵکی راسـت دەبێتـەوە، بۆیە کۆمەڵێ کتێبی زۆری بۆ پەیدا کرد تا تەنیایی خـۆی پـێ پـڕ بکاتـەوە و گرنگترینیـان کتێبێکـی (عائیـشەی

تەیموری) بوو سەبارەت بە ئافرەت کە زۆربەی برگەکانی لەبەرکردبوو.

وازی نەدەهێنا بە کتێب و خوێندنەوەی ئازاد، رۆژێکیان لە ماڵ چووە دەرەوە لە گەرەکی (شەبرا) ئەو کاتە تەمەنی دوانزە ساڵ بوو، بەشەقامەکاندا دەگەڕا، چاوی کەوت بە قوتابخانەیەکی تایبەت بە کچان، لە دەرگاکەیدا، کاتێ دەرگاوانەکە پرسیاری لێکرد؟ پێی وت: هاتووم چاوم بکەوێت بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە!! لێی پرسی بۆچی؟ ئەویش بە بڕوابە خۆبوونەوە وتی: من زەینەبی غەزالیم کە ناسراوم بە نوسەیبەی کچی کەعبی مازنی، مەوعیدم هەیە لە گەڵیدا، دەرگاوانەکەش کردیە ژوورەوە و سەرسام بوو لە هەڵوێستی ئەو کچە بچووکە.

زەینەب چووە ژووری بەڕێوەبەر و بە شێوەیەکی ئالی وتی (السلام علیکم و رحمة الله و برکاته) من خاتوو زەینەبی غەزالیم و نازناوم نوسیبەی کچی کەعبی مازنیە، پیاوەکەش تەماشایەکی کرد و وایزانی جنۆکە چووەتە لاشەیەوە، بە هۆی شێوازی قسەکردنیەوە، پاشان پێی وت: چیت ئەوێ خاتوو زەینب یان خاتوو نوسیبە؟

ئەمیش بەسەرهاتی خۆی و هەڵوێستی بـرا گەورەکـەی بۆ گێرایەوە، کـە نایـەڵێت بخوێنێـت و داوای لێکـرد کـە وەریبگرێـت وەك خوێنکارێـك لــە قوتابخانەکـەدا، کـاتێ بەڕێوەبەرەکە پرسیاری باوکی و براکەی کرد خێزانەکەیانی ناسیەوە و باپیریشی ناسیەوە کە بازرگـانێکی بـەناوبانگی لۆکـە بـوو، وە باوکیـشی بـەناوبانگ بـوو، بەڕێوەبـەری قوتابخانەکە سەرسام بوو بە زیرەکی کچەکە و بوێریەکەی، بۆیە بـە چـەند پرسـیارێك تـاقیکردەوە، ئـەویش زۆر بـە متمانە بـە خۆبوونـەوە وەڵامـی دایـەوە، بەڕێوەبـەر داوای لێکرد عەلی برای بهێنێت کە سوورە لەسەر خوێنـدنی تـا تۆماری بکات لە قوتابخانـە، دوای دوومـانگ لەبـەردەوام بوونی لە خوێندن، تاقیکردنەوەیەك کرا و بە هۆیەوە چووە پۆلێکی ترەوە، پاش ئەوە رۆشتە پۆلی یەکەمی ناوەندی.

- **یەکێتی ئافرەتان:**

دوای ئــەوەی رۆشـــتە ناوەندیـــەوە لـــە یـتەکێ لــە رۆژنامەکاندا خوێندیەوە کە ئەو یەکیەتیی ئافرەتانەی کە (هـودا شـەعراوی) سـەرۆکایەتی دەکـات کۆمـەڵێ کـچ

دەنێرێت بۆ فەرەنسا کە پێکهاتبوون لە سێ کەس یەکەمیان بۆ بواری جوانکاری و دووەمیان بۆ بواری پەروەردەی منداڵ و سێیەمیان بۆ بواری مافەکان و بەرگریردن لە ئافرەت.. بە پەلە رۆشت بۆ بنکەی یەکێتی ئافرەتان و چاوی کەوت بە (هودا شەعراوی)و ئەویش خۆشحاڵی خۆی بۆ دەربری و بەزەیی پێدا هاتەوە و پاشان بە پەلە لە ریزبەندی ئەو سێ قوتابیە کچە تۆماریکرد و کچەکەی پێشکەش بە پێشەنگی رێکخراوەکە کرد و باسی بەسەرهاتەکاتەی بۆ کرد، ئەمیش وتاربێژێکی بەتوانا بوو، چونکە هونەری وتاردان لە باوکیەوە فێربوو بوو.

دوای ئەوە مەوعیدی سەفەرەکەی دیاریکرا و زەینەب باوکی لە خەودا بینی کە داوای لێدەکات کە سەفەر نەکات بۆ فەرەنسا و پێی دەڵێت بەراستی خوای گەورە لە میسر قەرەبووت بۆ دەکاتەوە بە زیاتر لەوەی کە لەو گەشتەدا دەستت دەکەوێت، ئەمیش پێی وت: چۆن؟! وتی: دەیبینیت، بەلام سەفەر مەکە، چونکە من رازی نیم لەسەر ئەو سەفەرە.. (هودا شەعراوی) زۆر سەرسام بوو

بەو بڕیارە، هەستایەوە و باوەشی کرد بە زەینبدا لە کاتێکدا کە دەگریا و دەستەکانی دەگوشی و وتی بۆچی زەینەب؟ بۆچی زەینەب؟ تۆ ئومێدێکێت لە ئومێدەکانی من، خەونێکیت لە خەونەکانی من، ئەمیش خەونەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: هەندێك لە خەونەکان دێنە دی و هەندێکیشیان نایەنە دی، ئەم فرسەتە لە دەست خۆت مەدە... زەینەب غەزالیش پێی وت: مادام باوکم فەرمانی پێداوم، منیش سەرپێچی فەرمانەکەی ناکەم، پاشان رۆشتەوە بۆ کارکردن لە میانی ئەو یەکێتیەی ئافرەتانەدا کە ئەم یەکێك بوو لە ئەندامانی دیاری دەستەی کارگێریی... هەرچەندە هەندێ لە ئەندامەکانی تر پێچەوانەی رەفتاری ئەم دەبوونەوە، چونکە رەفتارەکانی دوور نەبوون لە مۆرکێکی ئیسلامیانە، بەلام (هودا شەعراوی) دەستی پێوە بوو، وە داینابوو کە جێنشینی خۆی بێت، بە نیسبەت ئەمەوە خەون و ئومێدەکانی خۆی تێدا دەبینیەوە.

- **جەنگ لەگەڵ ئەزهەرەیەکان:**

زەینەب غەزالی چەندین جەنگی بەرپاکرد دژی ئەزهەریەکان کە تێیدا تێکۆشانی دەکرد بۆ یەکێتی ئافرەتان، بڕوا بوونی زەینەب بە هودا شەعراوی و پرۆژەکەی جیگای مەترسی بوو، چونکە دادەنرێ بە تەڵەیەك بۆ هەموو ئافرەتان، ئەزهەری پیرۆز یەکەمین بنکە بوو کە هۆشداری سەبارەت بەو مەسەلەیە دا و کەوتە بەرەنگاریەکی توند و سەختەوە لەگەڵ یەکێتی ئافرەتاندا، وە لە ئەنجامدا چەندین پەیڤین و سیمیناری رۆشنبیری ئەنجامدرا، لە هەندێ لە کولێژ و پەیمانگاکانی ئەزهەردا و تێیدا یەکێتی ئافرەتان بانگهێشت دەکرا بۆ پەیڤین... بۆیە (هودا شەعراوی)ش سێ کچی دانا کە نوێنەرایەتی یەکیەتیەکەی بکەن لەو سیمینارانەدا، لەوانەش (زەینەب غەزالی) و (سیزا نەبراوی) و (حەوا ئیدریس- کە کچی خاڵی هودا شەعراوی بوو).

لە یەکێ لەو بۆنانەدا شێخانی ئەزهەر باسی بانگەوازەکەی (هودا شەعراوی)دەکرد و دەیانسەلماند کە

دەیـــەوێت ئـــافرەتی موســـڵمان بباتـــە دەرەوەی تـــەعالیمی شەرعی و زەینەبیش وەڵامێکی تونـدی دانـەوە و جـەختی لەسەر ئەوە کرد کە (هودا شەعراوی) دەیـــەوێت ئـافرەتی موسڵمان پایەبەرزتر بکات و گەشە بە عـەقڵ و تێگەیشتن و وێنـــای بـــدات،وە هەوڵـــدان لـــە پێنـــاو بەدەســـتهێنانی مافەکانیدا.. تا دواهەمینی ئـەو دروشـمـە درۆینـە و بریـق وباقانە کە زۆر بە راستگۆیانە بانگەشەی بۆ دەکـرد و وای دەزانی راستەقینەیە بەلای خۆیەوە!

رۆژێکیان بـەرەو رووی مامۆسـتای ئەزهـەر دەبێتـەوە، ئەمیش بەرەو روویان دەوسـتێ و پـشتگیری بۆچـوونەکانی هودا شەعراوی دەکات، ئەوانیش ناچار دەبـن کـە داوا لـە مامۆسـتا (عەبـد رەببـە) بکـەن کـە سـەرۆکی بەشـی ئامۆژگاری و ئیرشادی ئەزهەرە کە رێگا نەدات ئـەو کـچە وتار بدات، بەلام مامۆستا (عەبد رەببە) خاوەنی زانست و بیرێکی فراوان دەبێت و دەڵێت: دە مامۆستا لـە زانایـانی ئەزهەر بەرەنگاری بوونەوەی و نەیانتوانی قەناعـەتی پـێ بهێنین، باشە ئێمە ئەگەر رێگامان نەدا وتار بـدات، ئـەوە

دەبێتــە هــۆی خراپــی هەڵــسوکەوتی ئێمــە و راســتی بانگەشەکانی ئەو.. بۆیە مــن بەرەنگاربوونــەوەی بــە بــاش دادەنــیم.. یــەکێ لــە زاناکــان کــە نــاوی (شــێخ محمــد النجار)بوو، وتی: من دانێن بۆ ئەو!!!

بۆ رۆژی دوایی کاتێ لەگــەڵ دوو هاورێکەیــدا ســیزا و حەوا رۆشت بۆ دانیشتن، مامۆستاکە هات و وتی (الــسلام علیکم و رحمة الله و برکاته) ســلاویش لــە تــۆ ئــەی ئــەو ئافرەتەی کە موناقەشە لە گەڵ زانایانی ئەزهەر دەکەیت و بەرگری لە بــەرێز (هــودا شــەعراوی) و رێکخراوەکــەی و ئامانجەکانی دەکەیت.

(زەینەب غەزالیش) هەستایەوە وتی : سەرەتا من ناوم (زەینەب غەزالی الجبیلــی)یــە و ســلاو و رەحمــەتی خــوای گەورەش لە ئێوە، پاشان وتاری دا بۆ کچەکان، مامۆستاش بە وردی سەرنجیدا، دوای ئەوەی کە لێبوویەوە و ئافرەتەکان چوونە دەرەوە، بــە زەینــەبی وت: کــچی خــۆم رێگــام پــێ دەدەیت چەند خولەکێك لە بواری بانگــەوازی ئیــسلامیدا قسەت بۆ بکەم؟

ئـەویش وتـی: بێگومـان لـە خزمەتتـدام، فـەرموو.. مامۆستاکە دانیشت و پاشان هەردوو دەستی بـەرزکردەوە بۆ ئاسمـان و دوعـاکردن و وتـی خوایـە گیـان مـن لێـت دەپاڕێمەوە بەناوە جوانەکانت و بەو کتێبەت کە ناردووتـە خوارەوە و بەو پێغەمبەرەی کە ناردووتە، کە ئـەم ئافرەتـە بگێڕیت بۆ ئیسلام، بە راسـتی تـۆ توانـا داریـت بەسـەر هەموو شتێکدا.. تکات لێدەکەم بە قورئان کە بیگێڕیـت بۆ ئیسلام وە صلی الله علی سیدنا محمد.. پاشان چاوەکانی پڕبوون لـە ئـاو.. زەینـەبیش خـۆی بـۆ نـەگیرا و ئـەویش چـاوەکانی پـڕ بـوون لـە ئـاو و هەوڵیـدا لەبـەردەم مامۆستاکەدا بیشارێتەوە، پاشان لێی پرسی: بۆچی پێت وایە کە من لە گەڵ خوای گەورەدا نیم، خۆ من نوێژ دەکەم و رۆژوو دەگرم و قورئان دەخوێنم ئەگەر خوای گـەورە بـۆی رەخـساندم حـەجی مـاڵی خـواش دەکـەم و هـەروەها ئاواتەخوازم شەهید ببم لە پێناوی خوادا.

شێخ نەجار وتی: منیش هەروا تۆ دەبینم و بەردەوام بوو لەسەر دوعاکردنەکەی و پاشان وتی: ئایا پاش گەڕانەوەت

دەڕۆیت بۆلای (هودا شەعراوی)یان لە گەڵ خوا و پێغەمبەرکەی دەمینیتەوە؟

ئەویش وتی: من بێگومان کاتێك لە گەڵ (هودا شەعراوی) دام واهەست دەکەم کە لە گەڵ خوا و پێغەمبەرەکەشیدام، ئەویش وتی: ئایا پەیمانم پێ دەدەیت لەسەر سەرخستنی هەق و راستی، ئەویش پەیمانی پێدا.

پاشان پەیوەندی لە گەڵ شێخ نەجاردا بەردەوام بوو کە کۆمەڵێ کاروباری ئاینی و زۆری بۆ باس دەکرد کە نەیدەزانی، کە پێش ئەوەی زانیاری هەبێت دەربارەی رای پێچەوانەی هەبوو، بۆیە چاوی کراوەیە بە رووی زۆر شتدا کە پێشتر نەیدەزانی.

- **بالا پۆشی.**

رۆژێکیان زەینەب رۆشتە مەتبەخ بۆ چاودێری چێشت و خواردنەکان لە کاتی ئامادەکردنیاندا، بۆیە لە ئەنجامدا غەزاکە تەقیەوە پیایدا و ئاگر روخساری و هەموو جەستەی داگیرکرد، کاتێ پزیشك بینی و دەستکرا بە فریاگوزاری پێویست، داوای لێکرد کە نەجوڵێت و لە سەر

جێگاکە بخەوێت و هەواڵی بە براکانیدا کە پێویستە ببرێت بۆ دەرەوەی وەڵات بۆ چارەسەرکردن، بەڵام ئەم رازی نەبوو سەفەر بکات و جەستەی نیشانی کەسانی غەریب و نامۆ بدات.. پزیکەکەش رۆژانە دەهات و چارەسەری برین و سوتاویەکانی دەکرد.. بەڵام حاڵەتی رۆژ لە دوای رۆژ خراپتر دەبوو.. پزیشك و خێزانەکەشی ئومێدیان نەمابوو کە چاك بێتەوە.. پزیشکەکەش بە براکەی وت: بێگومان دەمرێت و چاك نابێتەوە، براکەشی هەواڵەکەی دا بە خزمانی کە پزیشکەکە چی دەڵێت.. بۆیە ماتەمینی سەراپا ماڵەکەی داگیرکرد و بە زەینەبیشیان نەدەوت.. بەڵام ئەم گوێی لە دەنگی براکەیەوە بوو کاتێك کە بە تەلەفۆن قسەی دەکرد، هەرچەندە براکەی هەوڵی زۆریدا کە ئەم گوێی لێ نەبێت... زەینەب تەیەوومی کرد و سەرقاڵی خواپەرستی بوو بۆ ئامادەبوون بۆ مردن و لە خوای گەورە پاڕایەوە و وتی: پەروەردگارا ئەگەر ئەم سزایە ئەوەیە کە من چوومەتە ناو رێکخراوەکەی هودا شەعراویەوە، ئەوە من بڕیارمداوە کە راستت ببمە بۆ رەزامەندی تۆ و ئەگەر رق

و تووڕەیی تۆ بۆ سەر من لەبەر ئەوەیە کە شەپقەم لەسەر کردووە ئەوە لای دەبەم و حیجاب دەپۆشم و من پەیمان و بەیعەتت پێدەدەم ئەگەر لاشەم بگەڕێتەوە بارودۆخی جارانی ئەوە دەست لەکارکێشانەوەی خۆم پێشکەش بە یەکێتی ئافرەتان دەکەم و ڕێکخراوێك بۆ ئافرەتانی موسڵمان دادەمەزرێنم بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی و کاردەکەین بۆ گەڕانەوەی ئافرەتی موسڵمان بۆ سەر ڕەفتار و کرداری ئەو ئافرەتانەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوون و بانگەشە دەکەم بۆ گەڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی و کار دەکەم لە پێناویدا و تێدەکۆشم لە پێناوی خوادا، چەندە بتوانم.

سبحان الله... دڵسۆزی چەند شتێکی جوانە لە دوعاوە، وە راستەقینەیی تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خوا و دڵنیابوون لە دەستەڵاتی خوای گەورە بەسەر هەر شتێکدا کە بیەوێت.. زەینەب پێشبینی نەدەکرد کە بەو خێراییە وەڵامی دووعاکەی بدرێتەوە کە خۆی وەسفی دەکات.. کە بەڕاستی ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەر بوو، کە توانای

دیاریکراوی عەقڵی ئێمە ناتوانێت تێبگات لە توانای خوایی، کە شتەکان دەگۆڕێت بە پێچەوانەکانیان. تەنها بە کردنی دووعا لە کاتی ئاسایی خۆیدا لەفافەکان لێکرانەوە و تەنانەت خۆیی و هەموو ئامادەبووانیش سەرسام بوون.

پزیشکەکە لەوپەڕی سەرسام بوونیدا لێی پرسی تۆ کێیت!! هەرچی لەماڵەوە بوون دڵخۆش بوون بە شیفای و رویانکردە خوای گەورە و سوپاس و ستایشیان دەکرد.

پزیشکەکەش رازی نەبوو هیچ پارەیەك وەربگرێ، دوای ئەوەی کە بە چاوی خۆی ئەو گۆڕانە کتوپڕەی بینی و هەردەیووت: سبحان الله.. سبحان الله بەراستی خوا تواناترە بەسەر هەموو شتێکدا.

- **وازهێنان:**

کاتێ زەینەب چاك بوویەوە و جەستەی وەکو پێش سووتاویەکەی لێهاتەوە، یەکەم شتێ کە ئەنجامیدا ئەوە بوو پەیامێکی نارد بۆ (هودا شەعراوی)و رایگەیاند کە واز دەهێنێت لە یەکێتی ئافرەتان و دەستبەرداری هەموو

پۆشاکەکانی بوو، وە داوای لە براکەی کرد کە جبەیەکی پان و پۆڕ و سەرپۆشێکی بۆ بکڕێت کە لە جیاتی شەپقەکە بەکاری بهێنێت و سەری پێ داپۆشێ.

زۆر جار شتی زیان بەخش سوودی هەیە... بەڕاستی کارەساتی سوتانەکەی هەمووی خێر بوو، چونکە ئەو گۆڕانە گەورەیە روویدا و بیروبۆچوونی گۆڕی و بردی بەرەو سەرخستنی ئایینی ئیسلام و پابەندبوون بە حیجابی ئیسلامیەوە.

زانایانی ئەزهەر بە تایبەتی(شێخ نەجار)هەواڵی رێنمایی ئیمانیان پێ گەیشت زۆر دڵخۆش بوو، پاشان چالاکیەکانی زەینەب غەزالی دەستی پێکردەوە کەلە ساڵی١٩٣٦ز بوو کاتێ(کۆمەڵەی ئافرەتانی موسڵمان)ی دامەزراند و بە چاو روونیەوە بانگەوازی دەکرد بۆ لای رێگای خوا وە بەراستی کۆششێکی بە پیت بوو کە زۆر لە کادیرە ئیسلامیە ئافرەتەکان گەشەیانکرد و کاریان دەکرد بۆ بانگەواز.. هەر لە گەورەبوونیانەوە بە بێ ئەوەی بچن بە کوچە و رێچکە خراپەکاندا کە پێشتر زەینەب غەزالی پێدا

رۆشتووە بۆ گەڕان بە دوای رووناکیـدا کـە رێنمـایی کـرا دوای نارەحـەتی و دڵـسۆزی و گـەڕان و پاشـان گوشـراوی ئەزموونەکانی پێشکەش بەوانە کـرد کـە لـە دوای خـۆی دێن، وە ئاگادارکردنەوەیان لە هەڵدێر و تیاچوون، بە هۆی زمان شیرینی و بریق وبـاقی دروشـم، کـە خۆشـی رۆژێـك سەرگەردانی ئەو شتانە بوو، بەڵام خوای گەورە رزگاریکرد کە خەریك بوو تیا دەچوو.

زەینەب غـەزالی کەسـێکی دیـار و بـەتوانا بـوو، لـە فەزحکردنی بانگەشە بەتاڵەکاندا و تۆوێکی صالّح بوو لە دایك بووبوو لەگەڵ بانگەوازێکی پیسدا، ئەم گوێی پێنەدا و رێگای هەقی گرتەبەر و بەرگری لەم بانگەوازە دەکرد تـا دوا هەناسەی ژیانی.

زەینەب کاتێك تام و چێژی ئیمـانی چەشـت و گەڕایـەوە دوای ئەوەی هەموو دروشمە و بریق و باقەکانی تاقیکردەوە، دوای ئـەوەی کە دڵنیابوو ئیسلام چەندە شایستەیە بۆ هەموو کات و شوێنێك، وە دڵنیابوو لە ناڕێکی هـەموو رێـچکەکانی تـر، تەنانـەت ئـەو رێچکانە نـاتوانن ئەوانـەش بەبـەردەوامی لەسـەر رێـچکەکەیان بهێڵنەوە کە لە بانگەشەکەرانن و بـەرگی لێدەکـەن و فوودەکـەن

پیایدا بۆ زیندووبونەوەی دوای ئەوەی کە راستیەکانیان بۆ دەردەکەویت و هەرەس دێنن لەبەردەم راستی ئیسلامدا و زیندوویەتی و گونجانی ئیسلام تا خوای گەورە دەیکاتە میراتی زەوی و ئەوەی لەسەر زەویدایە.

ئەمە بوو گەشتی زەینەب غەزالی،،گەشتی سەخت و نارەحەت لە شەپقەوە بۆ حیجاب.. رەوتی خۆیی گۆری تا پێشوازی لە قۆناغێکی تر بکات کە نارەحەتی زیاترە، ئای چ نارەحەتیەك.. چەندین نارەحەتی تووش هات.. جارێك لە رۆزیدا و جارێك بە بەندکردن و جارێکیش بە راوەدونان و ئەمیش بە گیانێکی بەرزەوە پێشوازی لەو نارەحەتیانە دەکرد و دەرکی بەوە دەکرد کە ئەمە سوونەتی ژیانی ژنانی بانگەوازکەری صالحە بۆ ئەوەی پاك بێتەوە لە هەموو پیسیەك لەبەردەم هەموو نارەحەتیەکاندا، رەحمەتی خوای لێبێت، خۆراگربوو، پاشان دوای سالانێکی درێژ لە زولم گەرایەوە تا تایینەکەی لە نێوان دەستیدا هەلگرێت، بەو هۆیەوە لە هەموو شوێنێك تا ئەمرۆ خەلکی بە شانازیەوە باسی دەکەن و خۆشیان دەوێت.. خوایە گیان بە باشترین شێوە پاداشتی بدەرەوە و کردەوەکانی لێوەربگرە کە تەنها لە پێناوی تۆدا ئەنجامی داوە.

لها أون لاين : محمد علی الغریب

## (مریم جمیله) لەتەسکایی یەهودیەوە بۆ بەرفروانی ئیسلام

خوایە گیان.. رێنمـایی و بینینـی روونـاکی و هـەق چەندە جوانە دوای تاریکایی، چـەندە جوانـە مـرۆڤ خـۆی ببینێتەوە لە نێو شەپۆلی ئیمانیدا کـە دەروونـی و رۆحـی ببوژێنێتەوە و بـە جەسـتەیدا بڵاوبێتـەوە دوای درێـژی و برسیەتی و ماندوبوونی [إِنَّكَ لآ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْـتَ وَلَكِـنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَـدِينَ] واتـە:( بەراسـتی تـۆ رێنمایی ئەو کەسە ناکەیت کە خۆشت دەوێ بەڵکو خوای گەورە رێنومـایی ئەو کەسە دەکات کە خۆی دەیەوێ).

ئەوەش مەریەم جەمیلە ئەو نموونە ناوازەیەی ئـافرەت کە گەڕا بە دوای راستیدا و ئارامیگرت و خۆڕاگر بـوو تـا رێگای خوای گـەورەی دۆزیـەوە و بـۆی دەرکـەوت و زانـی ژیانی مرۆڤ یان بۆ خۆیەتی یان لەسـەر خۆیـەتی و رۆڵـی خـۆیی بینـی لـە ژیانـدا، وەك ئـافرەتێکی موسـڵمان بانگەوازی دەکرد بۆ رێـی خـوا و بەرەنگاربوونـەوەی یاسـا بەتاڵەکان و بەرەنگاریان دەبوویەوە.

- **مارگرێت مارکوس**

**مارگرێت مارکوس (مەریەم جەمیلە) لە ساڵی ١٩٣٤ ز لە شاری نیۆیۆرك لە دایك بوو، لە دایك وباوكێكی جولەكە، سەرەتای خوێندنی لە ناوچەی(ویستشیر) دەست پێكردووە و رەفتار و شێوازی بیركردنەوەی هەر لە سەرەتادا پێشبینی ئەوەی لێدەكرا كە زەمین لەرزەیەك رەوتی ژیانی دەگۆڕێت و لە تاریكاییەوە دەیبات بەرەو رووناكی و رایدەكێشێت و دووری دەخاتەوە لە زۆنگاوی یەهودیەت، تاوەكو هۆگری ئیسلام بێت، هەر بە منداڵی حەزی لە كتێب بوو، رقی لە سینەما و سەما و مۆسیقای پۆپ بوو، هەرگیز مەوعیدی لە گەڵ كوڕاندا نەبوو، وە رێگای ئاهەنگە تێكەڵەكان و ژوانە ئەویندارییەكانی نەدەزانی.**

**مەریەم دەڵێت(هەر لە تەمەنی دە ساڵیەوە حەزم لە خوێندنەوەی هەموو ئەو كتێبانە بوو كە باسی عەرەبیان دەكرد و دەركم بەوە كرد كە عەرەبەكان ئیسلامیان بە مەزنی نەگێڕاوە، بەڵكو ئیسلام ئەوانی لە خێڵەكی و**

هۆزی ناو بیابانی وشك و بەرین گۆڕیوە بۆ سەرکردەیی جیهانی).

داوی دەرچوونی و سەرکەوتنی لە دواناوەندی لە هاوینی ١٩٥٢ز چووە بەشی دیراساتی ئەدەبی لە زانکۆی نیویۆرك بەڵام بۆ ساڵی ئاینده نەخۆش کەوت و ناچار بوو بۆ ماوەی دوو ساڵ نەخوێنێت، لەو ماوەیەدا دەستی کرد بە دیراسەکردنی ئیسلام و دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ خوێندن چەندین پرسیاری زۆری لە مێشکدا هەڵگرتبوو، لە گەڵ سۆز و خۆشەویستی بۆ موسڵمانان، گەیشت بە کچێکی جولەکە کە سوور بوو لەسەر ئەوەی موسڵمان بێت، ئەویش وەکو ئەم موسڵمانانی خۆش دەویست، ئاشنای کرد بە زۆرێك لە هاوڕێ عەرەبە موسڵمانەکان لە نیویۆرك، وە هەردووکیان ئامادەی ئەو وانانە دەبوون کە حاخامی جولەکە پێشکەشی دەکرد کە بابەتەکەی لەسەر (جولەکە لە ئیسلامدا) بوو حاخامەکە هەوڵی دەدا کە لە ژێر دروشمی بەراوردی ئایینەکان بە قوتابیەکان بسەلمێنێت کە هەرچی شتی چاکە لە ئیسلامدا راستەوخۆ لە (عهد

القدیم - التلمود )ـەوە وەرگیراوە کە تەفسیری جولەکەیە بۆ تەورات، وە ئەو کتێبە بڕیاردراوەی حاخامەکە دایناب‌وو هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆزی تێدابوو تا بنەمای هەر یەکێ لە ئایەتەکان بگێڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی جولەکە..

نا‌تەواوی و ناراستی

لەگەڵ ئەوەشدا صەهیۆنیەت بیروبۆچوونەکانی بەوپەڕی سەربەستیەوە بڵاودەکردەوە لە ڕێگای ڕێکلامەکان لە فیلمەکانەوە کە بانگەشەی دەکرد بۆ دەوڵەتی صەهیۆنی و پێشوازی لێدەکرد، بەڵام کارەکە بە نیسبەت ئەمەوە جیاواز بوو، چونکە ئەو بیروبۆچوونانە لە مێشکی ئەمدا زیاتر بەرەوی بە ئیسلام دەدا بەسەر جولەکەدا، چونکە صەهویۆنیەت هەمیشە پارێزگاری لەسەر سروشتی خێڵەکی تەسکی خۆی دەکاتەوە و لە کتێبەکانیاندا کە مێژووی یەهودیەتی تیا نووسراوەتەوە خوای ئەوان تایفەییە و تایبەتە بەوانەوە!!

لە جیاوازیە سەرسامەکان ئەوەیە کە سەرۆك وەزیرانی پێشووی ئیسرائیل(بن جوريون) باوەڕی نیە بە خوایەکی

زانراو كە سیفاتی خودی هەبێت و وای لێبكات لەسەرو سروشتەوە بێت، وە ناچێتە مەعبەدەكانی جولەكەوە و بەشەریعەتی جولەكە كار ناكات و رەچاوی داب و نەریتەكان ناكات، لە گەڵ ئەوەشدا كەسێكی لە پێشە لای باوەڕپێكراوان لە جولەكە تەقلیدیەكان، ئەوانەی كە ئەو دادەنین بە یەكێ لە گەورە جولەكەكانی ئەم سەردەمە، هەروەها زۆربەی سەركردە جولەكەكان بڕوایان وایە كە خوای گەورە وەكیلی عەقاراتە و زەوی بەخشیوە بەوان و تایبەتمەندی كردووە بەوان و كەسی تر ئەو مافەی نیە.

هەموو ئەو ناتەواویانە وای لەو كچە كرد كە بە خێرایی دەرك بە ناڕاستیەكانی جولەكە بكات، وە هەروەها رەقی زانا جولەكەكانی بۆ دەركەوت بەرامبەر بە موسڵمانەكان و بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ.. لەبەر ئەوە بە تێپەڕبوونی كات زیاتر دووردەكەوتەوە و رقی زیاتر دەبوو هەر كاتێك رۆبچوایە و قوڵ بووایەتەوە لە بیرچوونیان.

مەریەم دەستی كرد بە خوێندنەوەی تەفسیری قورئانی پیرۆز بە زمانی ئینگلیزی لە دانانی مامۆستا (محمد

بیکتول) بۆیــە لــە دڵیــدا چەســپا کــە ئەمــە کتێبێکــی ئاسمانیە و لــە لایــەن زاتێکــی زانــا و داناوەیــە لــە هــیچ شتێکدا زیادەڕۆیی نەکردووە و ڕۆژانە سەردانی کتێبخانەی گشتی نیویۆرکی دەکــرد.. زانــستی وەردەگــرت لــە چــوار بەرگی وەرگێڕدراوی (مشکاه المصابیح) کە تێیــدا وەڵامــی تەواو و باوەڕپێکراوی هەموو کاروبارە گرنگــەکانی ژیــانی تێدا دەستدەکەوت.. بۆیە زیــاتر هەســتی بــە لاوازی بــیری زۆرینەی کۆمەڵگاکەی دەکــرد کــە ژیــانی ڕۆژی دوایــی و لێپرسینەوە و پاداشت و سزایان دادەنا بــە میراتێکــی بــێ سوود.. وە بڕوای زیادی کرد لەمــە ترسی تەسلیم بــوون بــە شــەهوەتەکانی دەروون و ڕۆچــوون لــەناو ئــەو لــەزەت و خۆشیانەدا کە تەنها مرۆڤ بەرەو بــێ نــەوایی و عاقیبــەت شەڕی دەبات.

الله اکبر.. مەریەم لە دایك بوو:

لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکــانی ســاڵی ١٩٦١ز (مارگرێــت) بڕیاری خۆیدا.. ڕوویکردە بنکەی ئیسلامی لــە (بــرۆکلین) لە نیویۆرك و ئیسلامەیەتی خۆی ڕاگەیاند لە سەر دەستی

بانگخواز (داود فەیصل)وە ناوی خۆی گۆڕی بۆ (مەریەم جمیلە)وە بۆ ساڵی ئایندە رۆشت بۆ پاکستان کە لەلایەن (شێخ ئەبو ئەعلای مەودودی) بانگهێشت کرابوو، پاشان شویکرد بە بانگخوازێکی ئیسلامی(محمد یوسف خان)وە چوار منداڵی لێی بوو.

مەریەم دوای ئەوەی دەروونی ئارام و سەقامگیر بوو بە ناوی سازگار وتی:" هەرچەندە پاکستان وەك هەر وەڵاتێکی ئیسلامی تر بە خێرایی و بەردەوامی پیس دەبێت بە پیساییەکانی ئەوروپا، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت ژیانێکی رێك بەرێتەسەر کە بگونجێت لە گەڵ تەعالیمی ئیسلامدا، من دان بەوەدا دەنێم کە من هەندێ جار شکست دێنم لەوەدا کە ژیانی رۆژانەم وا لێبکەم بە تەواوی لە گەڵ تەعالیمی ئیسلامیدا بگونجێت، بەڵام دان بەو هەڵەیەدا دەنێم و تەنها بە هۆی ئەنجامدانیەوە و هەوڵدەدەم بە پێی توانا راستی بکەمەوە"

جەمیلە لەگەڵ رووداوەکانی جیهانی ئیسلامیی و رەوتە فیکریەکاندا ئاوێتە بووبوو، لە نامەیەکدا کە ئاراستەی

زۆربەی موسڵمانانی کرد وتی" دوای ڕێنمایی قورئان و سوننەت بکەون، نەك تەنها وەکو کۆمەڵێ دروشم بەڵکو وەکو سەرپەرشتیارێکی کردەیی بۆ ڕەفتارەکانی ژیانی تایبەتی و گشتی ڕۆژانەمان، و ناکۆیەکانیش وەلانێن.. کاتی بەهاداری خۆتان مەفەوتێنن بە شتە بێ ئەرزشەکانەوە و پشت بەخوای گەورە، خوای گەورە و بە دەسەڵات سەرکەوتووتان دەکات لە ژیانی دونیادا و ژیانی ڕۆژی دوایشتان دەبەنەوە).

مەریەم نیشتمانی ئەصلی خۆی لە یاد نەکرد و بەڵکو نامەیەکی نوسی بۆ دایك و باوکی لە مارسی١٩٨٣ز وتیایدا وتی" پێویستە ئەوە بزانن کە ئەو کۆمەڵگایەی ئێمە تیایدا ژیاوین و گەورە بووین تووشی پیسبوونێکی خێرابووە، ئێستا لە کەناری تیاچووندایە، ئێستا ئەمەریکا دووبارەبوونەوەی ڕۆمانی کۆنە لە قۆناغەکانی کۆتای هەرەسهێناندایە، وە هەروەها ئەورووپاش و هەر شوێنێکی دیکەش کە ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا زاڵ بووبێت بەسەریدا شکستیان هێناوە و بەراستی عەلمانیەت و مادیەت شکستیان هێناوە و نەیانتوانیووە ببنە بنەما بۆ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی سەرکەوتوو".

## کۆتایی غەش (قۆپیە)

ئەمە بەسەرهاتی قوتابییەکی کچە کە لە تاقیکردنەوەدا غەشی کردبوو بۆ پەند وەرگرتن، باسی دەکات و دەڵێت:" لە زانکۆدا دەمخوێند و تەمەنم نۆزدە ساڵ بوو، ئاشنابووم بە کچێکی هاوڕێیم کە لە رووی مادیەوە گوزەرانی باش بوو، وە ئەو کەسەی کە من شووم پێکردبوو، ئەویش خوێنکاری زانکۆ بوو، هیچ سەرچاوەیەکی داهاتمان نەبوو تەنها ئەو برە پارەیە نەبێت کە مانگانە دەیاندا پێمان.. منیش سەرسام بووم بە ئاستی کۆمەلایەتی هاورێکەم کە دەیان هەزار ریاڵ کۆدەکاتەوە و لە کۆتایی هەفتەدا گەشت دەکات بۆ یەکێ لە ولاتە عەرەبیە دراوسێەکان یان ولاتێکی ئەورووپی تا پشوویەك بدات، لەبەر ئەوە کاتی تەواوی نیە بۆ سەعیکردن، سەرسام بوو بە پۆشاکی و هەرگیز رۆژێك بیرم لە رەوشت و ئایینەکەی نەکردەوە، رۆشتینە هۆڵی تاقیکردنەوەی یەکێ لەوانە زانستیەکان، تکای لێکردم کە یارمەتی بدەم لە تاقیکردنەوەدا، وە وای نیشاندام کە غەشکردن

یارمەتیدانە و لە تەعالیمی ئاینی ئیسلامە، منیش بە هۆی نەزانینمەوە (چونکە دەیووت غەشکردن لە تاقیکردنەوەدا حەرام نیە بەڵکو شتێکی باشە چونکە یارمەیدانە)وە هەروەها منیش لەسەر ئەو کارەم پاداشت دەدرێمەوە لەلایەن خوای گەورەوە، بۆیە منیش هەر شتێکم بنوسیایە بەویشم دەووت.. هەرچەندە من لە مانگی کۆتایی سکەکەمدابووم، ئەویش دەینووسیەوە لە لاپەرەی تاقیکردنەوەکەدا، چونکە من لە نەزانینمەوە وام دەکرد، خوای گەورە ویستی وابوو کەوانەیەك فێرببم کە مندالەکانی خۆمی پێ فێربکەم و ئاگاداریان بکەمەوە لێی لە وەی کە تێیکەوتم... بۆ رۆژی دوایی دەستمان کرد بە تاقیکردنەوەی مادەی دووەم... پرسیارێکیان وەڵامەکەیم نووسیبوو بەڵام دەمویست دڵنیابم کە راستە یان نا، بۆیە پرسیارم لەوکەسە کرد کە لەو بڕوایەدا بووم هاورێی دڵسۆزمە، لە رێگای ئاماژەوە ئایا وەڵامەکە راستە یان نا؟ کەچی ئەو وەك رەشەبایەکی سەخت وەڵامی دامەوە: بڕۆ و

خۆت دڵنیا بکە لە ڕێگەی مامۆستاوە یان دوای ئەوەی کە دەچیتە دەرەوە خۆت دڵنیا بکە.

منیش بەو هۆیەوە زۆر بێتاقەت بووم، بە دەنگێکی بـــرز گریام، تا ئەو رادەیەی چاودێرەکەمان وا گومانی دەبرد کە بە هۆی ئازاری سکەکەمەوە دەگریم، ئـەویش زۆر ترســا و پرسیاری لێکردم کە ژمارەی مۆبایلی مێردەکەمی بـدەمێ تا بانگی بکات و بمبات بۆ نەخۆشخانە، منــیش وتم پێــی: نەخێر ئەمە ئازاری منداڵ بوون نیە بەڵکو هەسـت کـردن بە بێتاقەتیە!! لێی پرسیم: بۆچی بێتاقەتی؟ منیش وەڵامم نەدایەوە.. چونکە شەرمم دەکـرد کـە تاوانەکـەم ئاشـکرا بکەم کە کردوومە.. دوای ئـەو تاقیکردنــەوە و ئەزموونــە تۆبەم کرد کە ئیتر غەش نەکەم و هاوکاری کـەس نەکـەم وەك غەشــکردن.. وە لــە هــەموو تاقیکردنەوەکانــدا کــە منداڵەکانم ئـەنجامیان دەدا ئـەم بەســەرهاتەی خـۆمم بـۆ دەگێڕانەوە.

## ئەزموونم لە گەڵ کچەکەمدا

تووشی هەڵوێستێکی قورس بووم و سوپاس بۆ خوا بە هۆی بیرکردنەوەی هۆشیارانەوە بە ئاسانی ئەو هەڵوێستەم تێپەڕاند، کچەکەم لە قۆناغی سەرەتاییدا بوو، لە پۆلی چوارەمدا لە رۆژانی تاقیکردنەوەدا تووشی ئەنفلۆنزا بووبوو، وە تووشی تا و خیزەی سینگ بوو بوو، دەرمانەکانیش یارمەتی دەدا کە بحەوێت و تەرکیزی کەم دەکردەوە.. لە رۆژەکانی تاقیکردنەوەدا زۆر تووڕە بوو.. چونکە بەردەوام بێ هێز بوو، وە لە سەر جێگا کەوتبوو، کاتێ سەعیم پێ دەکرد زۆر ئاگای لە خۆی نەبوو، من لە خوا دەپاڕامەوە کە کۆمەکیم بکات تا سەعی پێ بکەم و بەردەوام بم بە بێ ناڕەحەتی و ماندوو بوون.. ئەوی تریش بە دەست خوای گەورەیە.

پێش تەواوبوونی تاقیکردنەوەکان بە سێ رۆژ کەسێکی نزیکم لە قوتابخانە پێی وتم کە کچەکەم لە وانەکانی

پێشوودا کەوتووە و پێی وتم کە مامۆستاکانی ئەو هەواڵەیان پێداوە.

هەستم کرد بە هۆی سەختی هەواڵەکەوە ناتوانم قاچم لە جێی خۆم بجولێنم، ئەو هەڵسوکەوتەی دوای ئەوە گرتمەبەر سوپاس بۆ خوا یارمەتی زۆری دام کە هەست و بۆچوونم بگۆڕم و لە ئازار و خەفەتەوە بۆ سووربوون و حەماسەت.. چونکە بە خۆمم وت: بۆچی من ئەوەندە و تا ئەو رادەیە بێتاقەتم، ئایا دوعا ئاراستەی کارەکان ناگۆڕێت و ئازاری سەرشانم کەم ناکاتەوە.

بۆچی سوپاسی پەروەردگارم نەکەم، کە من گوێم لە هەواڵی مردنی نەبوو یان گوێبیستی شتێك کە خوانەخواستە کەم ئەندامیەکی هەمیشەیی... بۆیە سوپاس بۆ خوا ساڵێکی فەوتاوە نەك هەموو ساڵەکانی، بە هەر حاڵ شەوانە هەڵدەستام و دوعام دەکرد و لە خوای بەتوانا دەپاڕامەوە کە گۆڕان بەسەر واقیعەکەدا بێنێت بەوەی کە باشە و چاکە، سوپاسی خوام دەکرد کە بەتوانایە

بەسەر هەموو شتێکدا، وە ئەمە هێورترە لە مینەتی گەورە.

موفاجەئات دوای تەواوبوونی تاقیکردنەوەکان روویدا.. وە من لەوپەڕی حەماسەتدا بووم، سووربووم لەسەر ئەوەی خوای گەورە بارودۆخەکان دەگۆڕێت، سەرسام بووم بە قسەی هاوڕێکەم کە کچەکەم نەکەوتووە تەنانەت لە وانەیەکیشدا، وە ئەویش سەرسام بوو بەو ئاستەی کە کچەکەم بەدەستی هێنابوو، وە خوای گەورە دەکەم بە شایەتی ئەو وتانەم.

## مێردی تووڕە

لەیلا بە هۆی تووڕەیی(عـادل)ی مێردیـەوە هەراسـان بووبــوو، ئــیتر نەیــدەتوانی ئــارام بگرێــت لەبــەردەم تووڕەییەکەیدا، چونکە ئەگەر هەڵەیەکی بکردایـە تـووڕە دەبوو بەسەریدا، یـا هەڵەکـەش بـەبێ مەبەسـت بووایـە، تووڕە دەبوو هەڵدەشاخا پیایدا.

ئەگەر دوا بکەوتایـە بـۆ سـاتێکیش لـە ئامـادەکردنی داواکاریەکانیدا وە ئەگەر ژنەکەی بیویـستایە تەمێیـەکێ لە مندالەکانی بکات دەیقڕاند بەسەریدا.

بە هۆی ئەو بارودۆخەی لەیلاوە چاری نەبوو ئەوە نەبێت کە بڕواتەوە بۆ ماڵی باوکی تا زۆر بێنێت بۆ مێردەکەی تا پەیمانی بداتێ کە ئیتر تووڕە نابێت لێی... عادل سـەردانی مـاڵی خەزوورەی کرد و خێزانی بینی و داوای پەشـیمانی و داوای لێبووردنی کرد کە بە هۆی تووڕەییەوە چ ڕەفتـارێکی نواندووە.. ژنەکەشی وتی: من لێبووردنەکەت قبـول دەکـەم بەڵام ناگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە تـا پـەیمانم نـەدەیتێ کـە ئـیتر

تووڕە نابیت... ئەویش وتی: منیش پەیمانت دەدەمێ..
ژنەکەی وتی: ئەی ئەگەر تووڕە بوویت؟
وتی: پەیمان بێت ئەگەر هەرجارێك تووڕە بووم (١٠٠)دینارت دەدەمێ،
وتی: باشە رازیم،

لەیلا گەڕایەوە بۆ ماڵی مێردەکەی و دڵخۆش بوو بەوەی کە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، چونکە لە هەموو روویەکەوە براوەیە، ئەگەر عادل تووڕە بێت پارەی دەداتێ و ئەگەر تووڕەش نەبێت دڵئارام دەبێت و بەخۆشی دەژی.

رۆژگار تێپەڕی و هێمن و ئارامیی باڵی کێشا بەسەر ژیانیاندا.. عادل تووڕە نەدەبوو ئیتر بە بێ هۆ نەیدەقیڕاند بەسەر ژنەکەیدا.. کاتێکیش شتێك تووڕەی بکردایە و رازی نەبووایە پێی پەیمانەکەی بیری مێردەکەی دەخستەوە و ئەویش ١٠٠ دیناری دەدایە و دانی بەخویدا دەگرت.

مێردەکەشی هەڵەکانی خۆی راست دەکردەوە و ئامۆژگاری ژن و منداڵەکەی دەکرد و ئاراستەی دەکردن بۆ

ئەنجامــدانی فــەرزەکان و ئەرکــە ئاییینیــەکان و هــەموو ئەمانەی ئەنجام دەدا بە هێمنی و بە بێدەنگی.

جارێکیان مێردەکـەی تـوورە دەبێـت و ژنەکەشـی بـە خۆشیەوە پێشوازی لە توورە بوونە کتوپڕەکەی دەکـات کـە لە سەرەتادا مێردەکەی سەرسام دەبێت، پاشـان دەرك بـەوە دەکات کە توورە بوونەکەی ناچاری دەکات کە ١٠٠ دینـار بدات بە ژنەکەی.

لەیلا بە پێکەنینەوە دەست درێژ دەکات بۆ مێردەکـەی و دەڵێ: دەی دەست بکە بە گیرفانتدا و ١٠٠ دینارم بەرێ، (عـادل)یـش خەنـدە دەیگـرێ و جیزدانەکـەی دەردێـنێ و پارەکە دەدات بە ژنەکەی و دەڵێت: بگرە ئەوە سـەد دینـار هەقی خۆتە.

لەیلاش بە پێکەنینـەوە دەسـت دەکـات بـە ژمـاردنی پارەکە و دەڵێت لە زووەووە چاوەڕوانی ئەو تـوورە بوونـەم... عادلیش ووتی: بیگومـان تـۆ دڵخـۆش بوویـت بـە تـوورە بوونم، چونکە پارەت دەسـت کـەوت، بـڕوام پـێ بکـە تـۆ زیـاترت دەســت دەکــەوت بــە ئارمگرتنــت لەســەر

تووڕەبوونەکانم پێش ئەوەی پەیمانت پێبدەم کە پارەت بەمیٚ.

عادل بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و ووتی: تۆ بەو ئارامگرتنەت ژنێکی چاك بوویت بۆ مێردەکەت و چاکیی تۆ بۆ من یەکسانە بە هەموو ئەو شتانەی پیاو دەستی دەکەویٚ لە پاداشت.. وەك پێغەمبەرﷺ مژدە بە هەموو ژنێکی موسڵمان دەدات (حُسْنُ تَبَعُّلِكَ لِزَوْجِكَ يَعدُلُ كُلَّ هَذا) چاکیەتی تۆ بۆ میردەکەت یەکسانە بە هەموو ئەوانە .وە من رێز لە سۆز و ئارامی تۆ دەگرم لەسە تووڕەبوونەکانم و لەناخمدا رێزی زۆری لێدەگرم و زۆر رازیم لە تۆ، وە پێغەمبەرﷺ مژدە بەو ئافرەتانە دەدات کە مێردەکانیان لێیان رازین و مژدەی بەهەشتیان پێدەدات و دەفەرموێت [أيُّما إمْرَأةٍ مَاتَتْ وَ زَوْجُها رَاضٍ عَنْهَا دَخَلَتْ الجَنَّة] واتە (هەر ئافرەتیٚ بمرێت و مێردەکەی لێی رازی بێت دەڕواتە بەهەشتەوە)

مجلة الاسرة ع:١٠٥ - ذوالحجة ١٤٢٢

## مردنی خاوەن عەباکە

یەکێ لە خوشکە نزیکەکانم بۆی گێڕامەوە کە لە دۆستێکیەوە بیستبووی ئەوانەی کە هەڵدەستن بە شۆردنی مردووەکان بە خۆبەخشی، ئەم بەسەرهاتە خەمناکەی بۆ گێڕامەوە: وتی جارێکیان ئافرەتێکی مردوویان هێنا، کاتێك ویستمان بیشۆین، بینیمان کە مەچەکی دەستی چەپی لکاوە بە شانی چەپیەوە ئێمەشە ویستمان دووریخەینەوە لە شانی، تاوەکو بتوانین بیشۆین، بەلاّم نەمانتوانی.. جارێکی تر هەوڵماندا، بەلاّم هەر نەماتوانی، دوای چەند جارێك توانیمان دەستی داگرین.. بەلاّم (سبحان الله) دوای ئەوەی لە شۆردنی بوینەوە دەستی رۆشتەوە بۆ شوێنی پێشووی سەرشانی، ئێمەشە سەرسام بووین و ترساین و تۆقین بە هۆی ئەو دیمەنەوە، بە پەلە هەستاین بە تەواوکردنی رێورەسمی شۆردنەکەی و کفن کردنی، پاشان دوای ئەوە کاتی ئەوە هات کە دایبهێڵینە ناو گۆڕەکەوە، کەسوکارەکەی تەماشاینکرد کە شێوەی مەیتەکە سەیر و نامۆیە بۆیە پرسیاریان لە ئێمە کرد،

ئێمەشــە رووداوەکــەمان بــۆ گێڕانــەوە، بۆیــە ناچــاربوون گۆڕەکە فراوان بکەن، تــاوەکو جێگــای مردوەکــە بێتــەوە، دوای دفن کردنی پرســیاری هۆکــاری ئــەوەمان لــە کــەس وکاری کرد؟ پێیان وتین: هیچ شــتێکمان لــێ نــەبینیووە خراپ بێت، تەنها ئەوە نەبێت عەبای داوە بە شانیدا، بەڵێ عەبای داوە بەسەر شانیدا.

المساحة العربية

## ئەمینە

بە خێرایی هەنگاوی دەنا بەڵکو خەریك بوو بازیدەدا، وە سەردانی هەموو بەشەکانی کرد، هەموو بەرهەمەکانی بەسەرکردەوە، تێبینیە وردەکانی سەبارەت بە بەشەکان نووسی کە بینیبووی، دڵئارام نەبوو هەتا لە ورد ودرشتی کارەکانی کۆڵیەوە، پاشان خاتوو ئەمینە رۆشت بۆ ژووری ئیدارە، کاغەز و قەڵەمێکی هەڵگرت و دەستیکرد بە نووسینی تێبینیەکان بۆ هەڵواسین بە شێوازێکی گەورە و روون لە سە کاغەزی جوان جوان.

نوسینەکان جوان بوون، فایلەکان ورد و رێك بوون، بەڵام شریتە بیستراوەکە شریتێکی هونەری دروست بوو، لە کاتی ئامادەکردندا تەنها شتێك مایەوە کە بەو پەڕی ئارامیەوە چاوەڕوانی بوو.. ئەویش کاسێتی ڤیدیۆیی بوو، کە لە کاتی ئاهەنگی ئامادەکراوی ئەمڕۆدا نمایش بکرێت.. لەسەر کورسیەکەی هەستایەوە و خەندەیەکی درێژی خستە سەر لێوانی.. لە ژوورەکەی چووە دەرەوە و بەو پەڕی فەخر و شانازیەوە راما لە تابلۆکان و لە ناخیدا هەندێ جار یادگاری کۆن دەهاتەوە یادی کە هێرشی بۆ دەهێنا.

ئەم ئێستا چەند سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت لەوەدا سەرکەوتوو نەبوو کە رادەکات لە رابردووی ئازاراوی، (سامی) ئەو برینە سارێژنەبووەیە کە بە درێژایی ژیانی ئازارێکی ناخۆش بوو، کە مێردەکەی دەیویست بۆ خۆی بێت بە تەنها، نەیدەهێشت لە ماڵ بچێتە دەرەوە تا باوەش بەسەرکەوتنەکانی ژیاندا بکات و پەیامێك پێشکەش بە نەتەوەکەی و کۆمەڵگا بکات..

گوێکانی کەڕ بوون لە ئاست ئامۆژگاریەکانی مێردەکەی سەبارەت بە رۆڵی دایك لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا، هەمیشە رۆڵی ئافرەتی کاریگەری دروستی ناوکۆمەڵگای دەدا بە گوێدا.. ئەو نەیدەتوانی دواهەمین وتووێژەکانی نێوان خۆی و مێردەکەی لە یاد بکات!!

حەز ئەکەم بەباشی لە من بگەیت من دژی کارکردنی ئافرەت نیم مەگەر پێچەوانە بێت لە گەڵ بەرپرسیاریەتی یەکەمیدا، بەرپرسیاریەتی گسك دان و مەتبەخ و جل شتن و ئوتووکردن... هتد

نەخێر رۆڵی ئەو پیرۆزە هەرچەندە ئەم کارانە بەشێکن لە بەرپرسیاریەتیەکەی، ژنەکەش بە گاڵتەوە وتی: دەستمانکرد بە فەلسەفە لێدان، فەرموو ئازیزم فێرم بکە

بزانم رۆڵی مـن چـیە... ئـەویش زۆر بـە لێبڕوانـە وەڵامـی دایەوە:

- من دەپرسم چۆن مرۆڤێك دەتوانرێـت پـەروەردە بكرێـت كـە كەسـايەتيەكی بـەهێزی هـەبێت و بیروبـاوەڕێكی چەسپاوی هەبێت لە كاتێكـدا كـە يـەك دايـك ناناسـێت بەڵكو كۆمەڵێ دايك دەناسێت؟

ئەويش بە هەڵچوونەوە وەڵامی دايەوە:

+ مەبەستت چيە؟

- بۆ نموونە تەماشای (سـامر)ی كوڕمـان بكـە... دوێنـێ بانگی دايكی دەكـرد بـە (زيـزی)و پێـشتر فـرێ دەدرايـە دامێنی دايكە(ئيوە)و ئەمڕۆش لـە پـاڵ دايكـە (ئـان)دا دەخەوێت، سبەينێش نازانم!! ئـەی دايكـە (ئەمينـە) لـە كوێيە!!

ئەويش بە سارديەك و سەرسەختيەكەوە دەيـووت: تـۆ باش دەزانيت كە دايكە (ئەمينە) سەرۆكی كۆمەڵەيـەكی خێرخوازی ئافرەتانە، ئەوەش پێويستی بە كاتی زۆر هەيە، ئەميش لە وەڵامدا دەيووت: ئەی چی بە دەسـت دێنيـت و مرۆڤايەتی چی بەدەست دێنێت ئەگەر هـەموو منـداڵانی ئەو كۆمەڵانە وەك (سامر)دەرچێت؟

ئەویش پێ پچڕی: سامر.. منداڵێکی وریا و بەتوانایە و بەهێزە، ماشەڵڵا لە هیچی کەم نیە.

مێردەکەی برۆکانی بەرزکردەوە و بە بێتاقەتیەوە وتی:

- ئەمە راستەقینەی مەینەتیەکەیە، کە چاوی خۆتی لێدەنوقێنیت، ئەویش بە هەڵچوونەوە وتی:

+ سەبارەت بە چ مەینەتیەك قسە دەکەیت، بێگومان تۆ زۆر ئەندێشە داریت.

- ئایا هەستت بە وشەکانی سامر نەکردووە ناتوانێ گوزارشت لە شتەکان بکات، زمانی خۆی نازانێت، ژنەکەشی بە گاڵتەپێکردنەوە پێی پچڕی:

- من نامەوێت بێتە (سیبەوەیه)ی سەردەمی خۆی، ئەویش بە گاڵتە ئامێزێکی ئاشکرا و غەمێکی شاراوەوە وەڵامی دایەوە:

- ئەگەر (سێبەویە)یش دەرنەچێت با (جاهیلی)بیت، ئەو زمانەکەی خۆی نازانێت، زمانی قورئان!! ئیتر چۆن فێری زانست دەبێت ئەی رۆشنبیر؟ ژنەکەش بەساردیەکەوە وەڵامی دایەوە:

+ گوێ مەدەرێ کاتێ گەورە دەبێت تێدەکات.

مێردەکەشی بۆی تەواو کرد:

- وە هەروەها ڕاڕابوونی لە بڕیاردانـدا و ئەوکەسـایەتیە لەرزۆك و ناجیگیرەکەشی باش دەبێت.
ژنەکە پێ بڕی: ئایا حوکمی کۆتاییت دەرکرد بۆ منداڵێك کە تازە پێی ناوەتە پێنچ ساڵیەوە، کوا لۆجیکە زانستیەکەت (سامی)؟
- بەڵکو ئەوە کرۆکی لۆجیکە، پەروەرشیاران هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێنج ساڵی یەکەم مەترسیدارترین قۆناغی پەروەردەیە و لەو ماوەیەدا بنەماکانی کەسایەتی سەربەخۆ دروست دەبێت.
ئەوانە قسەی بێ بنەمان، ئەوە ترۆپکی فەلسەفەیە، پێدەچێت هێشتا بۆچوونەکانمان نەگەشتبن بە یەك.
سامیش وتی: منیش دەخوازم کە هەرگیز بە یەك نەگەن.

سامی بە دڵشکاوی و غەمباریەوە لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە، بەڵکو خۆیدا بەسەر قەنەفەکەدا و یاری بە تاڵە قژەکانی سامر دەکرد، هەریەکەیان کەوتنە گەشتی خەونە تایبەتیەکانی خۆیانەوە، بۆشایی نیوانیان ڕۆژ بە ڕۆژ فراوانتر دەبوو، بۆشاییەکان دەبوونە تاریکستان.. هەریەکە بە شێوەیەکی جیاواز دەیانڕوانیە ژیان، با پێچەوانەی یەکتریش بووایە.

ژنەکە ئەو شەوەی بە بێتاقەتی بەسەر برد، هەستێکرد کە ناتوانێ موتابەعەی قسەکانی سامر بکات، بۆیە داوای کرد لە خزمەتکارەکە کە منداڵەکە بەرێت بۆ لای خۆی.

قەدەر لە چاوەڕوانی سامردا بوو چایە گەرمەکە رژا بە رووخساریدا، وە شوێنەوارێکی جێهێشت کە ساڵانیش نەیدەسڕیەوە.

سامی زۆر تووڕە بوو.. ئەو فرسەتەی قۆستەوە تاوەکو بڕیاری جیابوونەوە بدات.. دوای ئەوەی لە سەردانی پزیشك هاتەوە، بە تووڕەییەوە وتی: ئێمە رازی بووین بە شێوایە پەروەردەییەکان!! ئایا رازیش ببین بە شێوایە جەستەییەکان؟

ئەمیش بە هێمنیەکی دەستکردەوە ووتی: ئەوە قەدەری خوایە.. ئەویش بە تووڕەییەوە وتی: ئایا هەموو کەمتەرخەمیەکان کە لە تۆوە دەردەچن دەیدەیتە پاڵ قەدەر.. ئەمەش بێ عەقڵی و خلەفانێکی ترە.. ئەویش وتی: نەخێر تۆ سنووری خۆتت بەزاند، من بەمە رازی نابم.

- وە منیش نایەڵم ژیانم بەم شێوە خراپە بەردەوام بێت

+ کەواتە با... قسەکەی تەواو نەکرد... مێردەکەی دوای ئەوەی هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا وتی:

- بەڵێ با جیاببینەوە!!!

کاتێ گوێی لەو ووشەیەوە بوو وای زانی کە زللەیەکی گەورە دەردرێت لەسەر دڵی. هەستی بە ململانێیەکی سەخت کرد.

ئەو ساڵانێکە بە دوای ئازادی خۆیدا دەگەڕێت، لەوساتەدا کە دەستی کەوت وای هەست کرد بەناو ئاسمانێکی فراواندا سەرگەردان بووە.. هەنگاوەکانی تەتەڵەیان دەکرد و فرمێسکەکانی وشك بوونەوە .وشەکانی سەرزاری مردن .بەڵکو هەموو شتەکانی دەوروبەری مردن و دەیبنیی بێگیان بوون.. خۆزگەی دەخواست کە سامی پاشگەز بێتەوە.. هات بە خەیاڵیدا کە دەستەکانی ماچ بکات، بەڵام ئایا دەبێ فەرشی زەلیلی خۆی رابخات؟ خۆ بە زلزانیەکەی رێگای ئەوەی پێنەدا.. لە ژوورەکەی سامی چووە دەرەوە تا شتەکانی کۆبکاتەوە و دەست بکات بە ژیانی داهاتووی.

ئەوەتا ئێستا بەختیارە بە ژیانی خۆی و سەرکەوتنەکانی و بەشداریکردنە کۆمەڵایەتیە کاریگەرەکەی، سامی دەیەویست لەبیر بکرێت، کەچی ئێستا بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەکرێت، بەڵام ئەو شتەی کە بێتاقەتی دەکات سۆز و خۆشەویستیەتی بۆ (سامر) کوڕە خۆشەویستەکەی.

کۆنترۆڵی هەست و سۆزی خۆیی کرد و چووە دەرەوە تا ئەو کاسێتە ڤیدیۆییە ببینێت کە تایبەتە بە موعتاد بووانی مادە هۆشبەرەکانەوە.. سەرەتا کاسێتەکە باسی گرنگترینی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی دەکرد کە دەبێتە هۆی تێکچوونی لاوانی کوڕ و کچ.. لە توێژینەوەکەدا روون بوویەوە کە سەرگەردانی منداڵان بە هۆی یەکاڵابوونەوەی خێزانیەوە لە گرنگترینی هۆکارەکانە.

وتەبێژەکە وتی: ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە مادە هۆشبەرەکان خەریکە لە ناو مێردمنداڵاندا بڵاودەبێتەوە لە پڕ وێنەیەك لە قوربانیەکان دەرکەوت رووخساری (ئەمینە) گرژ بوو، دنیا لەبەر چاوی دەسوڕایەوەو وای هەستکرد کە پۆشاکی زەلیلی و سوکایەتی لەبەرکردووە... ئەو بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەکرێت نەك تەنها ئەمڕۆ بەڵکو بە درێژایی ژیانی، نەیتوانی تەماشای رووخساری ئامادەبووان بکات، چونکە وا هەستی دەکرد کە هەر چاوێك منداڵە موعتادەکەی دەبینێت دەیناسێتەوە... وەك چۆن خۆی ناسیەوە، بەلەرزەوە هەستایەوە.. هەستیکرد کە سەری بەرزی زۆر بەرز نابێتەوە لە زەوی، کە خەریکە سەری دەنووسێت بە زەویەوە... ئەم هەموو شتێکی لە فیکر و هەوڵ و عەقڵی پێشکەش بە نیشتمانەکەی و

مرۆڤایەتی کردووە، بەڵکو گرنگتریشی لەوە پێشکەش کردووە، لە هەموو مەدالیایەکی شەرەف لە بۆنەکاندا بەدەستی هێناوە دنیا لەبەر چاوی دەسوڕایەوە.. وە سەرنجی لە مەدالیای شەرەفی کۆتایی نەیا کە لە لایەن بەپەرسانەوە بەدەستی هێنابوو.. یەکێ لە ئافرەتەکان کە نزیك بوو لێیەوە تا مەدالیاکەی پێشکەش بکات و بە نیمچە سەرسامیەوە ووتی:

- من شایستەی ئەوە نیم.. سەرپەرشتیارەکەی پێی بڕی و ووتی:

+ ئەمە خاکیی بوونە لە تۆوە بەڵام تۆ سەرکەوتنی سەرسورهێنەرت بەدەست هێنا ئەی (ئەمینە خاتوون).

ئەویش بە دەنگێکی زەلیل و هێواشەوە وتی: بەڵێ... ئازیزم ..لە راستیدا من دایکی (سامر)م ئەو موعتادبووە بچوکە..کە نمایش دەکرێت!!.

أم إحسان حلو/ موقع الاسلام اليوم

## پۆزشم بۆ هێنایەوە

ئای چەندە لـە خۆبـایی بـوو، ئـەوە بۆچـوونی مـن بـوو بەرامبەر بە ئافرەتێکی دراوسێمان لە خانووە نوێکەماندا، لە گەرەکە راقیەکەدا، من پێشبینیم دەکـرد کـە هـەوڵی یـەکتر ناسـین بـدات لەگەڵمـدا و پێـشەوازیکردنم وەك دراوسـێیەکی نـویێ، بـەڵام وای نـەکرد، کـاتێ لـە بەرزکەرەوە (مصعد) کەدا یان لەبـەردەم دەرگـای ماڵـەوەدا بیبینیمایە خەندەیەکی دەستکردی ئاراستە دەکردم، پاشان بە خێرایی دەڕۆشت بەڵکو هەندێ جار پشگوێی دەخـستم، وەك ئەوەی هـەرگیز نـەیبینیبم، قـەیناکا خـۆی بـە چـی دەزانێت، منیش بە هـەمان شـێوە مامەڵـەی لـە گەڵـدا دەکەم و خراپتریش.

لە پڕ بینیم لە دەرگای ماڵمانی دا و بە چـاوی پـڕ لـە فرمێسکەوە داوای لێکردم کە مۆبایلەکـەم بـەکاربهێنێت بۆ پەیوەنـدیکردنێکی زۆر گـرنگ، لـە قـسەکردنەکەوە و ئەوەی کە بۆی باسکردم هەموو شتێ تێگەیشتم.

هەواڵی پێدام کە مێردەکەی نەخۆشە.. وە تووش بـوونی بـە نەخۆشـیەکە کتوپڕبـوو بـۆ ئـەم، وە ئـەم بـە تـەنها بەرپرسیاریەتی ماڵ و منداڵەکان و چاودیری مێردەکەی و حاڵەتـــە نارەحەتەکـــەی هـــەڵگرتووە، وە ئـــەم رووداوە کۆدەتایەکی سەختی لە ژیانیدا دروست کردووە.

هەستم بە شەرم کـرد کـاتێ بـە ناسـکی و شـکانەوەوە داوای لێبوردنی لێکردم کـە نـاتوانێ سـەردانم بکـات، و بەخێرهاتنم بکات، منیش پێم ووت: بەڵکو من دانـێ بـە خوشکێکی خۆت و هیچ جیاوازیەکمان نیـە...ئەگـەر ئـەو هەڵوێستە رووی نەدایـە و باسـی بـارودۆخی وردی خـۆیی نەکردایە هەر لەسەر گومانە هەڵەکەی خـۆم دەمامـەوە... بۆیە دەستم کر بە لۆمەکردنی خۆم، بۆچی من سەرەتا خۆم نەناساند پێی؟ ئەی بۆچی پۆزشم بـۆ نەهێنایـەوە؟ بۆچـی گومانی خراپم پـێش هـەموو شـتێك کـەوت ؟ لـە گـەڵ هـەموو ئەوانـەدا لــە نابـەجێیکردن بەرامبـەر بــە فەرمانەکانی ئیسلام و فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ کـوا وەسیەتی پێغەمبەر بەرامبـەر بـە دراوسـێ لـە چـەندین

فەرموودەدا؟ ﴿ما زال جبريل يوصيني بالجار حتى ظننت أنه يورثه﴾ واتە:(جوبەرئیل ئەوەندە وەسیەتی بۆکردووم بەرامبەر دراوسێ کە چاك بم تا ئەو رادەیەی کە وا گومانم دەبرد کە میراتی یەکتری دەبەن) وە دەفەرموویت ﴿من كان يؤمن بالله و اليوم الاخر فليكرم ضيفه﴾ واتە:(ئەوەی کە باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوای هەیە با ڕێزی میوانەکەی بگرێت).

بەراستی ژیانی مەدەنیەت و ژیانی نوێ نێوانمانی دوور خستووەتەوە و وای لە هەریەکەمان کردووە کە دەڵێی لە دوورگەیەکی دابڕاودا دەژین و لە ناوەڕاستی ژیانێکی جەنجاڵدا، هەریەکەمان سەرقاڵی خۆیەتی، گرنگیپێدانی بەرامبەر بە دەوروبەری لە سنوورێکی زۆر تەسکدایە، وە بە تەماشاکردنێکی بە پەلە و سارد و ناتەواو روانینە کەسانی تر، لە کاتێکدا ئەگەر هەر یەکەمان هەوڵبدەین بۆ پەیوەندی مرۆیی لەگەڵ دەوروبەریدا ئەوە ژیان جوانتر و خۆشتر دەبوو، ئەو کاتەش خۆشیەکانمان دوو بەرامبەر دەبوو، وە کەمتر هەستمان بە ماتەمینی دەکرد، و

ناخۆشیەکان هێور دەبوونەوە.. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت ﴿مَثَلُ المُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِهِمِ وَ تَرَاحُمِهِمْ وَ تَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلُ الجَسَدِ الواحِدِ إِذَا اشْتَكى عُضُوا تَدَاعى سَائِرُ الجَسَدِ بالحُمى وَ السَهْر﴾ واتە: (نموونەی باوەڕداران لە پەیوەندی و رەحم و سۆزیان بەرامبەر بە یەکتری وەك نموونەی یەك جەستە وان، ئەگەر ئەندامێکی ئەو جەستەیە ئازاری هەبێت هەموو جەستە تا دەیگرێت و شەونخونی بۆ دەکێشن)

وە ئەگەر هاوکاری یەکتر بین لە سەر چاکە و تەقوا و دەست لەناو دەست بکەین بۆ بەرەنگاربوونەوەی نارەحەتیەکان و بەشداربووین لە خۆشیەکاندا و ناخۆشیەکانمان بەشکرد ئەوە ژیان خۆشتر و جوانتر دەکات و ئێمەش وەکو دیوارێکی پتەومان لێدێت وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ﴿المُؤْمِنُ لَلْمُؤْمِنِ كَالبُنْيانِ يَشُدُّ بَعْضُهُمْ بَعْضاً﴾ واتە:(ئیماندار بۆ ئیماندار وەك دیوار و خانوو وان یەکتری پیکەوە توند وتۆڵ دەکەن)

ریهام ابراهیم/ موقع اسلام الیوم

## پەیمانمدا بە خۆم

من کچێکی کەنـداویی بـووم، تەمـەنم ۲۲ سـاڵ بـوو ئافرەتێکی بێئاگا بووم سەبارەت بـە کاروبـاری دنیـاش و جوانکاریەکانی رۆچووبووم، گوێم نەدەدا بەوەی کە دەیکەم و لە تەمەنم تەواو بووە کەوام هەسـت دەکـرد بـە خێرایـی تێپەڕیووە تا قەدەری خـوا وا بـوو کـە پـەیامی رێبـەری رێنومایکاران گەشتە پێگە ئەلەکترۆنیەکەم، خوایە گیـان چـۆن ئـەو ئامۆژگاریانـە هەسـتی ورووژانـدم و خەبـەری کردمەوە لە بێئاگایی، تەنانەت ویـژدانم لۆمـەی دەکـردم، هەرکاتێك یادی کردەوەکـانی رابـردووم دەکـردەوە کـە بـە پێچەوانەی رەزامەندی خوایە.. لە خۆمم پرسـی ئایـا ئـەو شتانە هیچ بەختەوەریەکیان بـۆ مـن بـەدیهێنا؟ نەبـەخوا لەناو ئەو خۆشیە درۆینانەدا هیچ حەوانەوە یان سوودم لـە دنیا نەبینی.. ئەوە رۆژی دوایی هەر هیچ، ئەگـەر بپرسـن ژیانم پێش ئەوەی خوای گەورە رێنومایم بکات چـۆن بـوو؟ بەیانیان هەڵدەستام و بەپەلە دەچووم بۆ زانکۆ تا وانەکانم

لە کیس نەچێت، تـاوەکو هەمیـشە لەسـەرکەوتوان بم، وە هەندێ جاریش نوێژی بەیانیم دەکرد ، بەڵام زۆربەی رۆژەکان بەداخەوە نوێـژم نـەدەکرد بـۆ ئـەوەی وانـەکانم لـە کـیس نەچێت... پاشان دوای ئەوە چی؟ بە شـەکەتی دەگەڕامـەوە بـۆ ماڵـەوە و پاشـان دەخـەوتم و دەچـوومە جیهـانی ئینتەرنێـتەوە، کاتی خۆمم پێ دەفەوتاند لە شتانێکدا کە خوای گەورە پێی رازی نیە، لە قسەکردن لەگـەڵ کـوڕان و کچان سەبارەت بە کاروباری دنیـا و دواهـەمین گـۆرانی و ئەو جۆرە شتانە، بەوشێوەیە قسەکان درێژەیان دەکێـشا تـا بانگی عەسر دەدرا، منیش بێئاگا بووم لـە زیکـری خـواو نوێژکردن... وە هەندێ جاریش دەچووم بۆ بازاڕ، ئەوە باسی کـات فەوتانـدن هـەر مەکـە... کـاتێ دەچـوومە دەرەوە جاونترین جلم دەپۆشی و بۆنم لە خۆم دەدا و بە زێـڕ خـۆمم دەڕازاندەوە، پاشان دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە و دەخـەوتم، بـەو شێوەیە زۆربـەی نوێـژەکانم دەفـەوتان، خوایـە گیـان لـەو کەمترخەمیانەی رابردووم خۆش بیت.

ئەوە بە هۆی نیازی خراپەوە نەبووە لـە لایـەن منـەوە، بەڵام بەهۆی بێئاگایی تەواومەوە بوو کـە زۆریـەی کـچان گرفتـاری بـوون، هـەموو ئەوانـە بـە هـۆی کـەمیی ئامۆژگاریەوە بـوو، لێـرەدا قـسەکانم ئاراسـتەی خوشـکە پابەندەکانە، کە کوا رۆڵی خوازراوتان بۆ رزگارکردنی ئـەو خوشکانەی کـە دەرفـەتیان بـۆ نەڕەخـساوە کـە کەسـێك دەستیان بگرێت و بەرەو رێگای رێنمایی بیانبات..

ئەو رۆژەم لە یادە کە لەرێگای رێبـەری رێنماکارانـەوە پەیامێکم بۆ هات بە ناوی (لەگەڵ باوەڕەکەتدا دەدوێم) وە هەروەها پەیامی (نامەیەك بۆگوزەرکەرێ)... کە پەیامێك بوو ئاراستەی ئافرەتی موسڵمان کرابوو کە ئیمان و شـەرم دوو شتی پێکەوە گرێـدراون، هـەروەها چـەندین رێنمـایی بەپێزی تێدابوو سـەبارەت بـە باڵاپۆشـی و مەرجـەکانی و هۆشیداریدا سەبارەت بە عەبای جوانکاری کە ئاگاتە پلەی باڵاپۆشی شەرعی کە پێویستی بە عەبایەکی تر هەیە تـا دایپۆشێ.

بەڕاستی منیش ڕۆچووم لە خوێندنەوەیدا، لە ڕاستیدا هەستم بە تەنگەتاوی دڵم کرد، کە نەمزانی بۆچی وام لێهات!! بە هەرحاڵ بەردەوام بووم لە خوێندنەوەی، بە خۆمم ووت ئایا ئەم وانانە و ئەم سەرکەوتنانەی خوێندن سوودم پێدەگەیێنن لە ڕۆژی دوایدا؟ چۆن دەبێت واز لە نوێژ بهێنم تاوەکو موحازەرەکانم لە کیس نەچێت، چۆن دەبێت تەمەنم لە شتی بێ ئەرزش و بێ سووددا بەسەر بەرم چ سودێك دەکەم ؟ ئەی ئایندەم چۆن دەبێت لە دنیا و ئاخیرەتدا؟؟.. سزا... !! بۆیە لە ناخی خۆمدا بڕیارمدا واز لەو شتانە بێنم کە لە رابردوودا دەمکرد، بۆیە بەڕاستی وازم لەو کارانە هێنا و دوورکەوتمەوە لێیی.. وردە وردە دەستم کر بە پارێزگاری نوێژەکان لە کاتی خۆیدا و نەمدەهێشت لە هیچ نوێژێك دوا بکەوم، تەنانەت ئەگەر وانەکانیشم لە کیس بچوایە، یان هەر شتێ کە نوێژم لە کیس بەرێت.. پاشان بەڵێنمدا بە خۆم کە بە ڕێگای ڕاستدا بڕۆم و واز لە خۆشیەکانی دنیا بێنم و ئاگاداری تەمەنم و ئەو ساڵانەی بێ سوود فەوتاوندوومە ببم.

ئێستا سوپاس بۆ خوا هەموو نوێژەکانم دەکەم و بەردەوام قورئانیش دەخوێنم و دووردەکەومەوە لە هەموو ئەو شتانەی زیانم پێدەگەێنن و وازم لە گوێگرتن لە گۆرانی و رۆشتن بۆ بازارِ هێناوە و وازم لە عەبای جوانکاری هێناوەو حیجابی پۆشتەیم پۆشیووە کەچۆن خوای گەورە دەیەوێت نەك چۆن خاوەن مۆدیلەکان دەیانەوێت...

• کتێبە چاپکراوەکانی وەرگێڕ:

١- (رۆشنبیری گشتی لە(٦٠٠٠) پرسیار و وەڵامدا).

٢- (لێکدانەوەی خەونەکان).

٣- (چۆن کۆبوونەوەی کورت و بەرهەمدار دەبەستیت)

٤- (هونەری هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هەرزەکار)

٥- (قوربانیانی شەیتان).

٦- (چیرۆکە قورئانیەکان بۆ منداڵان)

٧- (خوشکم رێگاکەت هەڵەکرد)

٨- (چۆن سەرکەوتوو دەبیت لە خوێندندا)

٩- (پەرستشەکانی بیرکردنەوە)

١٠- (چەکی کیمیایی)

١١- (چۆن نمرەی بەرز بەدەست دێنیت)

١٢- (پلاندانان)

١٣- ﴿ژیانی پێغەمبەر﴾ رووداوەکان و ژمارەکان.

١٤- (چیرۆکەکانی رێنمایی)

١٥- (نموونەی بەرز).

١٦- (قوربانیانی مادە هۆشبەرەکان)

١٧- (چیرۆکە کاریگەرەکان بۆ لاوان)

١٨- (بانکی زانیاری)

١٩- (رەوشتی ئیماندار)

٢٠- (کارەساتی هەڵەبجە و کەناڵەکانی رۆژئاوا)

٢١- (گۆڕانی دەروونەکان)

# ناوەڕۆك

